agonic , adj سه ر به کی: نه لادایی، نه گوشه کی

- line هیل یان ریزا سه ریه کی ، ریزا نه لادانا مه غنه تیزی

agonist , n . به شداریٔ کیشه ییٔ یان خه باتیٔ

agonistic , adj تنگژی . کیشه یان به رهه ڤدانخواز پیشبرکیٔ یی ( وه رزش )

agonistically , adv . ب به رهه ڤدانی

agonize , v . t . i . دنالت . دئیشت

agonized , adj . نالی ، ئیشایی

agonizing , n نالین

agonizingly , adv . ب نالینی

agony , n . دەردمه ندی ، ئازار ، ئارمان . هنیچ ، ژان . که ڤته له ڤت ، ئیش ، ئه شکه نجه

- column کارێته ییٔ ئاگه داری یێن که سی (د ناڤ روژنامه ئیدا )

- of death خه مور، کیڤه راتا مرنیٔ

agora , n . مه یدانا گشتی یا بازیریٔ گریکی ( یونانی )

agoraphobia , n ترسا درێت گشتی

agouti , n . ئه گوتی : جانەوەرەک ئه مریکانی کرنده مو ئو گوهـ کورت وه کی دی وه ک کیڤر وشکیٔ یه

agraf (f) e , n سنجه ڤه ک خه ملاندنا جلان

agrarian , adj کشتی، چاندنی

agrarian reform , n زه ڤی سازی ، باشکرنا چاندنیٔ کشتی سازی

agrarianism , n ته ڤگه را چاکرنا چاندنیٔ یان کشت و کالی

agree , v . i , t . قایل دبت ، پیک دهێت

agreeability , n . په سه ندباری

agreeable , adj ب جه هـ ، سازکار ، په سه ندبار ، خوش مروڤ

agreeably , adv . ب سازکاری

agreed , adj په سه ندکری ، پیکهاتی

agreeing , n به ر ب هه ڤ ، پیکهاتن

agreement , n . قیم ، ریک که تن، ته بایی ، گوزیدان پیکهاتن ، هه ڤهاتن

- violator . پیکهاتن شکین

agrestic , adj نه ڤه مشتی ، زڤر ، گوندی

agribusiness , n چاندنکار

agricultural , adj . چاندنی، کشت و کالی ، چاندنزانی

- cooperative هه ره وه زی یان زیاره یێن چاندنیٔ

- worker سه پان ، وه رزێر

agriculture , n کشت ، کشت وکال ، چاندن

agriculturally , adv . ب چاندنی

agricu lturist or agriculturalist , n چاندنزان ، چاندیار

agrimony , n ته خلیت شیناتی نه خاسمه گول

agrimotor , n بزوینا چاندنیٔ

agriology , n . خوه ندنا گه لین سه ره تایی

agroindustrial , adj چاندن پیشه سازی

agrology, n ئاخ چاندنزانی

agronomist . ئه ندازیاریٔ چاندنیٔ، پسپوریٔ چاندنا گوندی، چاندنزان

agronomy , n چاندنزانی زانینا چاندنیٔ، ئه نداز یاری یا چاندنیٔ

aground , adj , adv . ب ئه ردیٔ که تی ، ل سه ر ئه ردیٔ

- the ship ran .. گه می وه رگه را سه ر ئه ردیٔ

ague , n . له رز ، تا ( ل گه ل ساری ییٔ ، گه رمیٔ ئو خوهدانیٔ )

aguish , adj تایی

ah(interj ) نیشانا شادی، پێشه مانی، کوتی یان خه میٔ

A . H . سالا کوچی

a , h . ئه مپیر ده مژمیر

aha , interj نیشانا ترانه ییٔ، سه رکه تنیٔ یان گوهوشینیٔ

ahead , adv . ل به راهی ییٔ

Ahriman , n خودایێ به دی ییٔ

Ahura Mazda , n . خودایێ په ندیار، بونا بالا : خودایێ ڤه نجی ییٔ ئو روناهی ییٔ زه رده شتی

aid , v . t . i یارمه تیٔ ددت . هاری دکت

aid , n . یاریده دان ، هه ڤاری ، فریاگه ر ، پیتاک، فریا ، کومه ک، هاوار . هاریکاری، هاریکرن ، یارمه تی، فریا گوزاری

- first فریای به رایی . هاریکاری یا به راهی

aide , n هه ڤپشت، هاریکه ر، یاوه ر

aide - de - camp ( A . D . C . ) n . یاوه ر

aide - memoire , n . یادنامه ، بیرنامه

aigrette , n چه کێ سه ر ی (ژ په‌ریان گه وهه ری چیکری)
aiguille , n . قولکه ر یان سمتوکێ که فری، که فرێ سه ر تیژ
ail , v . t . i نه خوش ببت
ailanthus , n دارێ ئه سمانی :داره ک ده فه را به کسانه که رێ (نیف قابیرێ)
aileron , n . چه نگک :پارچه‌یه‌ک فه ک ژ چه نگێ بالافرێ بۆ هه فسه نگی یێ
ailing . n نه خوش . نه ساخ
ailment , n نه ساخی ، نه خوشی
ailurophile , n حه زکه رێ کتکان
ailurophobe , n نه حه زکه رێ کتکان
aim , v . i . t . ئارمانجێ دگرت ، ستێرگی دگرت
aim , n. ئامانج ، مه به ست ، سه ر دل ، داخواز مه ره م ، ئارمانج ، کام
aimed , adj راچافکری
aiming , n راچافکرن
aimless , adj مه هیران . گه فج ، بێ ئارمانج
aimlessly , adv . گوتره ، بێ ئارمانجی
aimless ness , n . بێ ئارمانجیتی
air , v . t . ژوهادکت ، ددت به ر بایی
air , n . که ش، با، هه و ا
- base . بنکێ بایی یان هه وایی
- bladder میزدانا بایی ، باتو
- borne فه گوهازتنا ئه سمانی
- bridge پرا ئه سمانی ( بالافری )
- cooler با سارک
- current , n . ره وتکا بایی
- express فه گوهازتنا ئه سمانی یا گورزه یان
- force هێزا ئه سمانی
- fresh بایێ هێن ، بایێ پاک
- hostess مێفاندارا فروکه یێ
-lift هێلا ئازوقه کرنا ئه سمانی ، پرا ئه سمانی
- mail پوسته یێ ئه سمانی
- mass بارسته یێ بایی
air condition , n باگوهێزک
air conditioner , n باسارک ، باخوشک، با گوهێزک
air conditioning , n باسارکرن ، باگوهارتن
air craft , n بالافر ، فروکه
aircrew , n. بالافرفان یان کارکه رێن بالافرێ
airdrome , n. فرگه
air field , n. فرگه
air flow , n. ره وتکا بایێ بالافرێ
airless , adj. بێ با
airing , n. باکرن نیشاندان
airletter کاغه زا پوسته یێ ئه سمانی ، نامه یا پوسته یێ ئه سمانی
air line , n. هێلا ئه سمانی
air man, n. فروکه فان
air plane , n. بالافر ، فروکه
air pocket , n. به ر یکا بایی
air post , n. = air mail
air port , n. فروکه خانه ، فرگه ، بالافرگه
air proof , n. به رگری بایی
air pump , n . باتێکه ر
air sac , n. کیسکێ بایی ، باخانه ، میزدانکا بایی یا ماسی یا
airscrew , n. په روانه یا بالافرێ
air shaft , n کاریته یێ بایی ( بۆ با گوهارتنێ )
air ship, n بالونا بزوینکری
air sick, adj. گێژیێ ئه سمانی
airspace, n. مه ودایێ ئه سمانی ( بۆ ده وله ته کێ )
airspeed, n. له زا دینامی یا بایی
air stream , n.= air flow
airstewardess . مێفاندارا فروکه یێ
air stream , n باگه ر
air strip داهاتنگه یا بالافران
air tight دژبا گرتی، بێ کون
air - to - air ژ ئه سمانی بۆ ئه سمانی
air ways , n هێلێن بایی ( هه وایی )
air woman بالافرفان (مێ)
air worthy کێرهاتی بۆ فرینێ
airy , adj بایی . هه وایی، بلند ، ل ئه سمانان به ربه کری ، ئاشوپی ، شاد، لاو ، نازک، باکری ، فه کری ، قاپان
aisle , n دابه شکرنا دیرێ ، راره و . رێکا نافبه را کورسیکا
aitch bone , n گوشتێ رانێ گولکی ( ل سه ر هه ستی !)
ajar , adv , adj پچه کێ فه کری
akimbo , adj , adv . ده ست ل سه ر کێله کێ
akin , adj وه ک ، خزم ، مروف
ala , n بال . چه نگ
alabaster , n گێچ . مه رمه ر

| | |
|---|---|
| *alabasterine , adj* | مه ر مه ری |
| a la carte , adj | خوارنا به ها ب ئامان |
| alacrity , n | چالاکی ، لیکدانا خوش |
| a la mode , adj | موده دار |
| alar , adj | چه نگی |
| alarm , n | هه ژلین ، ترس ، دیلی ، ئاگه هی یا سه همی یێ |
| - clock | ده مژمیرا ئاگه کرنێ |
| alarm , v . t | ئاگه هدار دکت ، هشیار دکت |
| alarmed , adj | هه ژڤاندی ، هه ژلی |
| alarming , n | ترسینه ر ، ترسناک ، توقاندن |
| alarmism , n | ترساندنیتی |
| alarmist , n | ترسنوک |
| alary , adj = alar | |
| alas ! | واخ ! وای ! وه ی . |
| ala spurra , n | زر باله . زر چه نگ |
| alastor , n | دیوێ تولدار |
| alate ( d ) , adj | بالدار . چه نگدار |
| alb , n | کراسێ دریژێ ئولداران |
| albata , n | زیڤێ ئه لمانی ، میرتالێ سپی |
| albacore , n | ماسی یه ک ده ریایی مه زن |
| Albanian , n | ئه لبانی ، وه لاتی یێ ئه لبانیا |
| albatross , n | توخمه ک بالنده ل ده ریایێ هه دار |
| albeit , conj | هه رچه ند |
| albescent , adj | سپی بویی |
| albine , n | به ر سپیڤه ، قوله ، به له ک |
| Albion , n | ئنگلیزستان ( هوزانی ) |
| albite , n | ئه لبایت : فیلدسپارا سودا یان سپی |
| album , n | ئه لبوم ( ده فته را ) ئیمزا، پول یان وێنه قاوێن هه لبژار ێن توری یان مه ز یقه یی |
| albumen , n | سپینه ، سپیلک ، سپیلکه یا هیکێ |
| albumin , n | سپیلک |
| albuminous , alboninose | سپیلکی |
| albumin uria , n | میزا سپیلکی |
| alburnum , n. = sapwood | |
| alchemic (al ) | کیمیایی یا که ڤن |
| alchemist , n | کیمیاڤان |
| alchemize , vt . | دگوهورت ( ب که ڤنه کیمیایێ ) |
| alchemized , adj | گوهارتی |
| alchemizing , n | گوهارتن |
| *alchemy , n* | *کیمیایا که ڤن بۆ گوهارتنا کانزین* ئه رزان بۆ زێری ئو دریژکرنا ژی یی |
| alcohol , n . | مه ی ، کحول |
| alcoholic , adj | مه ی ڤه خوار، مه ست سه رخوش |
| alcoholism ,n | مه ی به نگی ، مه ی ڤه خوارنیتی |
| alcoholize , vt . | کحول دکت |
| alcohol meter , n | کحولپیڤ |
| alcoholometry,n . | پیڤانا کحولی |
| Alcoran , n | قورئان |
| alcove , n | شکه فتوک |
| alcyone , n | ئه یرێ شه مه دانێ |
| aldehyde , n | ئه لدیها ید : ئاڤه کی یه ک فرینی بێ ره نگ بێهن خه نقین ژ ئوکسید بونا کحولی چێدبت |
| alder , n | ئه راشێ ئاڤخوازدار وه ک به لوکێ |
| alderman , n | جیگرێ که ڤنیشاهێ ئنگلیز، جڤاتڤان |
| ale , n | بیره یا سڤک |
| - wifc | خودانا بیره خانه یێ |
| aleatory , adj | سه ر به ختی |
| alee | ل سه ر ره خێ که می یێ دورێ ژ بایی |
| alehouse , n | بیره خانه |
| alembic , n | ئالاڤا کیمیایی یا دلوپاندنێ |
| alegar , n | بیره یا سڤکا ترش |
| alert , v.t . | ئاگه دکت، هشیاردکت ، وریادکت |
| alert , adj , n . | وریا ، لیکدایی ، گورج ، چاڤ ڤه کری . هشیار ، هایدار |
| - on the ... | های ژ خوه هه یه |
| alerted , adj | هشیارکری ، هایدارکری |
| alerting , n | هشیارکرن ، هایدان |
| alertness , n | ئاگه هیبون ، ئاگه هی . هشیاری |
| alcurene , n | ئه لورین : ماده یه ک دیندکی پروتینی دناڤ تویڤلێ هنده ک هه له زاندا |
| alexia , n | کوراتی یا خوه ندنێ |
| alexin , n | به کتریا کوژ |
| alfa paorticle , n | پرتکا ئه لفا |
| - ray | تیریژا ئه لفا، ئه لفا تیشکا |
| alfalfa , n | هه له زه ک سێپه لێ یه (ئالیفه ) |
| alg(o) - | پیشگره کو ئێشه |
| alga , n | ڤه وزه ، که ڤزه ر ، که ڤز |
| algarbra , n | ئه لحه برزانی ، جه بر |
| algabraic (al) , adj | جه بری |

| | |
|---|---|
| algabraic equation , n | هه فکیشه یا جه بری |
| algabraic expression,n | ده ربرینا جه بری |
| algabraic function , n | هوکاریٛ جه بریٛ |
| algabraist , n | زاناییٛ جه بریٛ . جه برزان |
| Algerian . n , adj | جه زائری |
| - algia | پاشگره کو ئیشه ، ژانه |
| algid , adj | سار |
| algoid , adj | که فزی |
| algolagnia , n | خوه‌شی‌یا ئیٛشاندنیٛ یان ئیٛشانیٛ |
| algology , n | زانینا که فزان |
| algometer , n | ژانپیف ( ب هشا ژانا په ستینیٛ ) |
| algophobia , n | تر ئیٛشی |
| algorism,n(algorithm) | لوغاریتم |
| ali- | پیٛشگره کو چه نگ ، باله |
| alias , n , adv . | زر یان پاچ ناف |
| alibi , n | به هانه یان دروفا بیٛ تا وانی یێ |
| alibi , vt | به ردت ، ب به هانه یا بیٛ تاوانی یێ |
| alien , adj , n | بیانی |
| alienable , adj | گوهێزبار |
| alienate , v. t | ( خودانی یا سامانی ) دگوهورت یان دگوهیٛزت ، سل دکت ، دور دئیٛخت |
| alienated , adj | ئه نراندی |
| alienating , n | ئه نر اندن |
| alienation , adj | دامالین، دلهیٛلان ، تاره ک ، دورکرن گوهازتنا خودانی یا سامانی ، شاشی یا هشی ، جودابون |
| alienee , n | بزگوهازتی |
| alienist , n | پزیشکیٛ هشی |
| alienor , n | گوهیٛز : ( خودانی یا سامانی ) |
| aliform , adj | شکل چه نگ ، وه ک چه نگی |
| alight , v. t . | په یا دبت |
| alight , adj , adv | سوتی ، شه وتی ، هلکری |
| .alighted , adj | په یابویی ، لوسیا ، ئه نشتی |
| alighting, n . | به یابوون[illegible] نشتن لوسین داهشتن |
| align , v . t . i . | هیٛل دکت |
| aligned , adj | لایه نگیر ، ئالیکار ، ره ففکری ، ئالگر هه فالدار . ئالیگر . ره ففاندی |
| aligning , n | ریزکرن ، لاگیری . هه فالداری |
| alignment , n | ریزکرن ، لاگیری ، تاگیری |
| alignmental , adj | لاگیری یی |
| alike , a , adv . | وه ک هه ف، وه که یه ک |
| aliment , n | خوارده مه نی ، خوراک |
| alimentary , adj | خوراکی |
| alimentation , n | خواراندن |
| alimentative,adj= nutritive | |
| alimony , n | پاره ییٛن خودانکرنیٛ |
| aliphatic , adj | به زدار |
| aliquant , adj | دابه شیٛ نه ته مام |
| aliquot ,adj | دابه شیٛ ته مام |
| alive , adj | ساخه ساز ، ساخ ، زینده وه ر چه له نگ .ژیندار .ره نده ک . زندی،گیاندار |
| alizarin , n | بویه یه ک سور |
| alkali , n | تفت، قلیٛ |
| alkalimeter , n | قلیٛ پیف |
| alkaline , adj | قلیٛ یی |
| alkalinity , n | قلیٛ تی |
| alkalinization , n | قلیکرن |
| alkalinize , v . t . | قلیٛ دکت |
| alkanet , n | گه وند یان گزرز |
| all , adj. adv : pron | گشت ، ته مام ، ته ف ، تیٛکڕا گشک ، گش . هه می ، هه مو |
| -...alone | ب ته نیٛ، بیٛ هاریکه ر |
| - ...along | هه رده م ، ژ ده ستپیکیٛ |
| -... around | زه حف، شه هره‌زا، گشت، هه موکی |
| -... but | نیٛزیک |
| -... clear | نیشانا نه مانا مه ترسی یێ |
| - daylong | هه می روژیٛ |
| - in ... | هه می یه . هه رتشت |
| -... in all | سه رهه فدا |
| -.. one to me | یه ک تشته بوٛ من |
| -...over Asia | ل هه می ئاسیا |
| - ... right | باشه ! ل گه ل ته مه |
| -above ... | به ری هه می یێ |
| - after ... | پشتی هه می یێ، ل گه ل هندیٛ |
| - at ... | ئیٛکجار |
| - for ....that | ل گه ل هندیٛ |
| - for good and .. | هه تا هه تا |
| - in ... | تیٛکرا |
| - not at .. . | ئیٛکجا ر ، سه ر چافا |
| - to be .....over | ته مام دبت |
| - to be ... over with | ویٛران دبت ، ل به ر مرنیٛ یه |
| allay , vt | هه دار دکت |

| | |
|---|---|
| allaying , n | هه داركرن |
| allegation , n | داواكارى |
| allege , vt . | دبيژت |
| allegiance , n . | دلسوزى ، راژێربون |
| allegiant , adj | دلسوز ، ئه مه كدار |
| allegoric (al) , adj | خوازه يى |
| allegorize , vt | خوازه يى ده ردبرت |
| allegory , n | خوازه ، چيروكا هيمايى |
| allegretto , adj , n | ڤلينا له زين ، له زين |
| allegro , adj | له زتر ، زوتر . |
| alleluia , interj | خودا مه زنكرن |
| allemande , n | مه زيقه يان سه ما يه ک ئه لمانى |
| allergen , n | ماده يێ هه ستيارى يان لێ نه هاتى |
| allergic , adj | لێ نه هاتنى |
| allergy , n | لێ نه هاتن |
| alleviate , vt | وێله دبت ، هه دار دكت |
| alleviation , n | هه دار كرن |
| alley , n | كولانک ، كوچه |
| alleyway , n | ئالوله . كولانک |
| All Fools Day , n | يه كى نيسانێ |
| all fours, n , pl . | هه ر چار : ده ست ئو پێ يێن مروڤى، لنگێن ده وارى |
| All hallows , n | جه ژ نا هه مو پيروزان |
| all heal , n . | گيايێن پزيشكى يێن گه ليرى |
| alliaceous , adj | سيرى ، پيڤازى ، وه ک سير يان پيڤازى |
| alliance , n | په يمان ، هه ڤالبه ندى |
| allied , adj | هه ڤالبه ند، هه ڤ په يما نكرى |
| alligator , n | تيمساحێ ئه مريكانى ، كه ڤلێ ڤى تيمساحى |
| alliterate , vi , t | په يڤێن ب هه مان تيپان ده ست پێدكن ب كار دئينت |
| alliteration , n . | ب كار هێنانا په يڤێن ب هه مان تيپان ده ست پێدكن |
| allocate , v. | دادنت : دابه ش دكت، به هر دكت |
| allocation , n | دانان، به هر |
| allocution , n | گوتارا ميرى |
| allogamous , adj | په يێنكرنى يا تيكل |
| allogamy , n | په يێنكرنا تيكل |
| allomeric growth , n | وه رارا بنيات گوهور |
| allomerism , n | گوهورينبارى يا بنياتا كيميايى بێ گوهورينا شكلێ توڤى |
| allomorphism , n= allotropy | |
| all-or - none - law | ياسايا هه مى يان نه |

| | |
|---|---|
| allot , vt . | دابه ش دكت ، به لاڤ دكت |
| allotment , n | دابه شكرن |
| allotrope , n | شكلێ گوهورينا له شێ تايبه خويان بێ گوهورينا ماده يى |
| allotropic , adj | ژ شكلێ گوهورينا تايبه خويان |
| allotropy , n | گوهورينا تايبه خويێن له شى بێ گوهورينا ماده يى |
| allotee , n | خودان به هر ، بۆدابه شكرى |
| all- out , adj | هه مو كى |
| allover , adj , n | ل سه ر هه مو رۆيى ، هه موكى ، ته ڤنێ ل سه رهه مى رۆيى چاپكرى، نه قشێ ل سه ر هه مى رۆيى |
| allow , v . t , i | دهێلت |
| allowable , adj | ره وا |
| allowance , n | ده رماله، رێدان . هێلان، هێشتن |
| allowed , adj | ره وا |
| allowing , n | هێشتن ، هێلان ، رێدان |
| alloy , n | دارشته ، ميرتالێن تيكل |
| alloy , vt | تيكل دكت .(ميرتا لان) |
| all right, adv , adj | باشه ، گه له ک باش |
| all - round = all around | |
| All Saints Day . n . | جه ژنا هه مو پيروزان ( يه كى چرى يا دوه م ) |
| allseed , n | توڤدار: هه له زه ک تير توڤ |
| allset , adj | ليكدايى |
| AllSouls Day,n | جه ژنا مرى يان |
| allspice , n | بيبه را شرين |
| all thei sm , n | په رستنا گێره خودايان |
| allude , vt | نيشان دكت |
| allure , v. t . | ڤيت دكت، قايل دكت ( ڤيتكارى) |
| allurement , n . | ڤيتكارى |
| alluring , n , adj | ڤيت ، دايلان |
| allusion , n | سه رنج ، نيشانكرن |
| allusive , adj | نيشانكرى |
| alluvial , adj , n . | سێلاخ ، ونک ، تلول، سێلاک ، نيشته يى ، ليم |
| alluvion , n . | ليم ، ليته |
| alluvium , n | سێلاخ، ونک، سێلاک، تلول، ليم، ليته |
| ally , v. t . i . | يه ک دگرن |
| ally , n | سوندخوارى . هه ڤالبه ند ، هه ڤال دوست . هه ڤ سوند، هه ڤ په يمان ، په يمانكه ر |
| allying ,n | هه ڤ په يمانكرن |

almanac , n سالنامه
almighty , n , adj خودا، ئیکجار هیزدار
almond , n . بادام ، به هیف ، باهیف
- eyed چاف باهیف
almoner , n ئه رکداریٚ به لاڤکرنا خیران
almost , adv . هه ما ، نیزیک
alms . n . خیر
almsgiver , adj خیرکار
almsgiving . n خیرکاری
almshouse , n په ناگه، په ناخانه ، مالاخیریٚ ، خیرگه
almsman , n هه ژاریٚ ل سه ر خیران دژیت
aloe , n ئه لو : هه له زه ک شیریز تاله دبیژن کو ده ر مانه بوٚ زکچونیٚ
aloft , adv . بلند ، بالا
aloha , interj گازی یا خیرهاتنیٚ یان ئوغریٚ
aloin , n ئه لوین : ده رمانیٚ زکچونیٚ ژ هه له زا (ئه لو ده رد که ڤت)
alone , a dj, adv . تنیٚ ، یه کتا ، ته ک ، بیٚ که س ، ته نیٚ، ته نیا
along , prep., adv . ب دریژایی
alongshore . نک به رئاڤی
alongside, adv , prep . دبه ررا
aloof , adv , a dj جودا ، ڤه ده ر
alopecia , n مووه‌ریان ، که چه لی
alory muscles , n زه بله کین چه نگدار . ماسولکه یین بالدار
aloud , adv . به رز ، بلند
alow, adv = below
alp , n چیا یه‌ک بلند، گوپیتکا چیایی، به نار
alpaca , n ئه لپاکا :جانه وه ره ک با شور ئه مریکی، لامایێ هری دریژئو ئه رم
alpe glow , n رڤینا به ر سوریێه ل سه ریٚ چیایان دیار دبیت ل روژ دمرکه‌تنیٚ یان ئاڤابونیٚ
alp (en ) horn , n بوریزان یان توتیکا شڤانین چیاییٚ ئه لپ ، ئه لفابیٚ
alpen stock , n داریٚ ئه لپی سه رک تیژ بوٚ سه ر که تنا چیایی
alpestine , adj ئه لپی ( ژ چیاییٚ ئه لپ )
alph , n ئه لیف
alpha , n ده ستپیک ، تیپا (ا)
- decay ئه لفا ئه مان
- emitter ئه لفا ده ر په رین
- particle پرتکا ئه لفا
- source ژیده ریٚ ئه لفا
alpha and omega , n ده ستپیک ئو دوماهی
alphabet , n ئه لفابیٚ

alphabetic ( al ) ,adj ئه لفابیٚ یی
alphabetically , adv . ب ئه لفابیٚ یی
alphabetization , n ئه لفا بیکرن
alphabetize , vt ئه لفابیٚ دکت
alpha iron , n ئاسنیٚ ئه لفا ( گ ر می ژ ٩١٠. ئه پتره )
Alpint , adj , n ئه لپی، بلند ( ژ چیاییٚ ئه لپ ) .
Alpinism , n سه رکه تنا چیایی
Alpinist , n سه رکه تی ییٚ چیایی
already , adv پیشان ، ئیدی ، هیش نوکه ، داها، دها
Alsatian , adj , n . ئه لزاسی
alright , = allright
also , adv . هه روه سا ، هه روه ها ، ژی ، دیسا . دیسان . ل سه ررا
- ran ئه وژی به زی ( سه رنه که تی )
alt , n ئاوازا بلند
Altaic , adj ئه لتایی (ژ چیاییٚ یه لتاییٚ ئاسیا ئاڤین یان خیزانا زمانین ڤیٚ ده ڤه ریٚ
altair , n هه لوییٚ فرنده
altar , n گوریگه، قوربانگه
altarpiece , n نه قشیٚ ل پشت ئو ل سه ر قوربانگه یا دیریٚ
altazimuth , n . بلند پیف
alter , vt , i دگوهورت :
alterability , n گوهورباری
alterable , adj گوهوربار
alterably , adv . ب گوهوری
alteration , n گوهوران
alterative , adj , n گوهورک
altercate , v , i . شه ری دکت ، سه رکیشی دکت
altercation , n . گه لج . سه رکیشیکرن
altered , adj گوهارتی
alter ego , n . که سی یا دی یا مرڤی
alterer , n گوهورکه ر
altering , n گوهارتن
alternant , n نوبه تی، نوره کی
alternate,v. t. i ,n,adj یه ده ک ، هه ڤ گه ل، نوره کی دکت
alternated , adj نوره کیکری
alternately , adv . ب نوره کی
alternating نوره کی
- current ره و ته کیٚ نوره کی
alternation , n هه ڤ گه لی . گوهارتن . نوبه تداری هه ڤ گه ل ، شونی، نوره کی
alternative , adj , n. گوهارتو

alternator , n گومێرک
althorn , n ئالاله ک مه ز یقه یی وه ک بوریز انێ
although , conj هه رچه ند
altimeter , n بلندی پیڤ
altimetry , n بلندی پیڤی
altitude , n . به رزایی ، به رزی ، بلندی
alto , n , adj بلندتر، ده نگێ نیر
altocumulus , n ئه ورێ گوگی به رسپیڤه
altogether , adv . به ر هه ڤ . هه می ، تێکرا
altorelievo , n نه قشێ به رز
altostratus , n ئه ورێ تاری
altruism , n قه نجیتی ، حه زکرنا ژ مروڤێن دی
altruist , adj قه نجی خواز
altruistic , adj پێوه ندیدارێ قه نجی خوازی
alum, n شه ب، زاخ
- solution گیراوی زاخ
alumina , n ئه لومینا : ئوکسیدێ ئه لومنیوم
aluminate , n ئه لومینێت
aluminiferous , adj ئه لومنیومی ( ئه لو منیوم تێدایه )
aluminize , vt . ب ئه لومنیوم دکت یان چاره دکت
aluminous , adj زاخی
aluminum , n ئه لومنیوم
alumna ده رکه تی یا زانستگه یان زانکو
aluminium , n = alminum فافون
alumnus , n . ده رکه تی یێ زاستگه هێ یان زانکویێ
alumroot , n . ره زاخ : ئه خلیت هه له زه
alunite , n ئه لو نایت
alveolar , adj وه ک شانه یا هنگڤینی
alveolate , adj کونکی، وه ک شانه یا هنگڤینی
alveolus , n کونکا ددانی ، کونک ، خانه کا پشا بایی
always , adv هه میشه . هه می جار، هه ر . تم، هه ر گاڤ . هه رده م ، هه رجار
alyssum , n ئه لیسون : هه له زه . گولا ئه لیسوم
am , v ده م
am(ante meridiem به ری نیڤرو
amadou , n ماده یه ک هه ورکی یه ( بۆ برینکاری یێ ئو ئاگرێ به رسته یی
amain , adv ژنشکی ، بێقام ، ب خورتی ، ب په له، ب له ز

amalgam , n تێکلی مێرتاله کێ ل گه ل جیوه یی وه ک زێری
amalgamate , adj تێکلبویی ، یه کبویی
amalgamate , v . t . i تێکل دکت
amalgamated , adj یه کبویی
amalgamating ,n یه ککرن
amalgamation , n یه کگرتن ، یه کبه تی ، تێکلکرن، یه کخستن
amalgamator , n تێکله ر
amanita , n . ئه مانیتا: کاره ک ژه هری یه
amanuensis , n قه که تن ، نڤیس روونڤیسه ر، رازگر
amar anth , n هه له زا ئاشوپا بێ قور مچین، ره نگێ ئه رخوانی یێ تاری ،ره نگێ قه ره نفه لی یێ به ر ئه رخوانیڤه ! ماریگولد، مه خمورک ، گول زێرین .
amaranthine , adj مه خموری،ماریگولدی ، گول زێرینی
amarelle , n هه رمی یا گێلاسی
amaryllis , n . ئه خلیت نێرگزه
amass , v, i . کوم دکت
amassed , adj قه ریول ، کومکری
amateur , n , adj . هه وه سکار ، خوازا . خولیا
amateurish , adj ئه پسپور ، ئه شه هره زا
amative , adj ئه ڤینباز
amativeness , n ڤینکاریتی،ره گه زخوازیتی، ئه ڤینبازیتی
amatol , n . ئه ماتول :ماده یه ک ته قه مه نی
amatory , adj . ئه ڤینبازی
amaurosis , n . کوره یی (پارچه کی یان هه موکی )
amaze , v. t . دگوهشینت
amazed , adj عه جێبمایی،عه جێبگرتی، گوهشاندی
amazement , n هه یهولان سه رسورمان، گوهشاندن
amazing , n . سه یرگێره ، بزده ین . سه رسورین
amazon , n ژنا شه رکه را ئه فسانه یی، ژنا خورتا دریژا زه لامی
amazonian , adj ژ رویبارێ ئه مازونێ ، ژنا خورتا زه لامی یا شه رخواز
ambassador , n ئێلچی، بالیوز
ambassadorial , adj بالیوزی
ambassadoress , n بالیوز ( ژن )
amber , n که هره مان : ماده یێ به ر بویی یان به ردینه یی ، زه رێ روون ، ئه میه ر، زه رێ به رسورافی

ambergris , n ئه مبه رگریس: ماده یێ مومی یێ خاف به رنافی ده ریایێن یه کسانه که ری
ambidexter , adj دورێ ، رزباز ، دو ده ستی ، چه پ ئو راست
ambidexterity , n دورێیی، رزبازی، دوده ستیتی
ambience , n با ، ئاف ئوبا، ژینگه، دور وبه ر
ambient , adj دور و به ری
ambiguity , n ده ربرینا دو واتایی
ambiguous , adj لێل، ئالوز ، گونگ . دو واتایی
ambiguously , adv ب دو واتایی، ب لێلی
ambiguousn ess , n لێلیتی، دو واتا یی تی
ambilogy , n دو واتایی
ambisexual , n adj . دوره گه ز
ambisexulity , n دو ره گه زیتی
ambit ,n . در ، مه ودا
ambition , n . تێکورکی ، بلندبینی ، به رز یخوازی
ambitionless , adj . بێ به رزیخوازی
ambitious , adj تێکورک . بلندبین ، ئازوه ر . ئاز ، ئه زوه . به رز یخواز
ambitiously , adv . ب به رز یخوازی
ambitious ness , n به رز یخوازیتی
ambivalence , n هه فدژی ، ناکوکی . دوبه هایی
ambivalent , adj دوبه ها ، ناکوک هه فدژ
ambiversion , n هه فهێزی یا جوداخوازی ئو جفاکخوازی
ambivert , n هه فتا یان هه فهێزێ جوداخواز ئو جفاکخواز
amble , v . t چارگافێ دکت
amble , n چاربازی ، چارگافی
ambler , n هه سپێ ره هوان
amblyopia , n کێم دیتن
ambrosia , n خورا کا خودایان
ambrosial , adj . ژخوراکاخودایی ، خودایی
ambry , n ئێر یان دولابا ئازوقه یی
ambulacral , adj کونگه یی
ambulacrum , n کونگه : بژ ده رکه تنا پێ یێن لوله کی یێن ماسی یا ستێری
ambulance , n هاریکرن ، یارمه تی، نه خوشخانه یا مه یدانێ ، نه خوشخانه یا گه روکا ل گه ل له شکه ری ، گوهێزوکا نه خوشان
ambulant , adj گوهێز، گه روک، نه خوشی یا دله شیدا دگه رت
ambulate , vi دگوهێزت ، دگه رت
ambulated , adj گه رایی
ambulating , n گه ران
ambulatory , adj,n گه روک
ambuscade , v . t , i بوسه له ددت
ambuscade , n مه لاس ، له دان ، به ره هه ک پێس ، مه لاسی . بوسه
ambush , v. t . i . بوسه له ددت
ambush , n بوسه، مه لاس .له دان ،به ره هه ک، پێس ، مه لاسی
ambushment , n بوسه
ameba , amebic =
amoeba , amoebic
amebiasis , n ئه میبیتی : ئه ساخی یا ئه میبیا
ameliorate , v . t . i باشتر دکت
..ameliorated , adj باشکری
ameliorating , n باشکرن
amelioration , n چاکرن ، باشکرن
ameliorative , a باشترکری
amen . ئامین ، ئێجا بلا وه بت
amenability , n به ر پرسیاری
amenable , adj به رپرسیار
amend , v . t . i به دی یێ به رددت ، باش دبت، راست دکت
amendable , adj بژاربار ، باشکرنبار ، راستبار
amendatory , adj بژاری ، راستکرنی ، باشکرنی
amender , n راستکه ر
amendment , n باشکرن ، بژارکرن، راستکرن
amends , n شوندان
amenity , n خوه ش ری ئو رێباز
amenorrhea , n چکبونا خوین دیتنێ یان مه هکێ
ament , n ئیشی یێ گولی یێ گول گه نمی
amentia , n دیناتی
American , adj ئه مریکان
Americana,n به لگه نامه، کتێب یان راستی ل سه ر ئه مریکا
Americanism , n زاراڤێ ئه مریکانی ، ئه رێتێ ئه مریکانی .سه ره تایێن چاندایا ئه مریکانی
Americanist , n ئه مریکانزان
Americanization , n ئه مریکانکرن
Americanize,v , t , i ئه مریکان دکت

americium , n ئه مریکیوم، هێما نه‌ک مێز تالی یه
Amerind , n هندوکێ سورێ ئه مریکانی
amethyst , n , adj . به رێ به هاگران
amethystine , adj ژ به رێ به ها گران
ametropia , n شاش دیتن
Amheric , n , adj . زمانێ میری یێ حه به شه
amiability , n سه رنه ر می
amiable , adj نازه نین ، میهرڤان ، رام ، سه رنه رم، نازک ، دوست
amiably , adv . ب سه رنه رمی
amicability , n . ئاشتیانیتی، ئاشتیانه تی، دوستیتی، هه ڤالی
amicable , adj رام، دوست
amicably , adv . شالوزی
amice , n کراسێ سه رملی یێ ئولداری
amid , prep . ناڤبه ر ، ل ناڤ
amide,n . ئه مید : پێکهاتی یه ک کیمیایی یه ژ ئه مونیا چێدبت ب گوهارتنا یه ک یان پتر ژگه‌ردیله یێن هایدروجینی ب رهه ک ترشی .
amido , n ئه میدی . ئه مینی ( کیمیا )
amidol , n ئه میدول: خویێ یه‌ک به لورێ بێ ره نگ بۆ دیارکرنا وێنه یان بکارد ئێت
amidships , adv . دنیڤا که شتیدا
amidst , prep , = amid
amine , n ئه مین : پێکهاتی یه ک کیمیایی ژ ئه مونیا چێدبت ب گوهارتنا گه ر دیله یێن هایدروجینی ب رهه ک تفت
amino , adj ئه مینی
- acids , n . ترشی یێن ئه مینی
amiss , adj , adv . چه وت
- to take.... دنه نرت
amitosis , n که ریونا یه کسه ر
amitotic , adj دابه شبونی یا نه فتیلی
amity , n . هه ڤالی ، یاری
ammcoete , n کرمکێ ده ڤ خر
ammeter , n ره وته ک پیڤ ، لوزه وپێو ، لوزه وپیڤ
- shunt ره وته ک یان لوزه و دابه شکه ر
ammino , adj ئه مین
ammonia , n . ئه مونیا نشادر،(گاز ه ک بێ ره نگ ئو بێهن تیژ)
- sulphate زاخا نشادرێ
ammoniac , n , adj ئه مونیاک : نشادری
ammoniacal , adj نشادری
ammoniate , vt نشادرکت
ammonify , vt نشادرکت، تێکل یان تێژ نشادرکت دگوهورت پێکهاتی یا نشادری ، نشادر دبت
Ammonite , n عه مونی : ژ گه لێ که ڤنێ سامی
ammonite , n به ردینه یێ هنده ک شه یتانوکێن
ammunition , n پوسات ، جه به ، جه بلخانه
(ammo ) جبه خانه
amnesia , n . بێ بیری
amncsty , v. t . لێدبورت . دبه خشینت
amnesty , n به خشاندن، به خشین ، لێبورین
amnion, n . په رده یا هوندوری یا ل دور پزی
amniotic cavity , n ڤالاتی یا ئاڤه کی یا ل دور پزی .
amniotic fluid , n ئاڤاکی یا ل دور پزی
amniotic sac , n سه رئاڤوک
amoeba , n ئه میبا : جانه وه رکێ یه ک خانه کو به رده وام دگوهورت
amoebiasis , n =amebiasi s
amoebicalso : amoeban -, adj ئه میبی
amoebid , adj وه ک ئه میبا
amok , n , adj , adv . هاری یا کوشتن خوازی ، ب هاری ئێریش
- to run .. هار دبه زت
amole , n ئه مول :رهێن هه له زا وه‌ک سابونێ
among(st) , prep . تێکل، نێوان ،ناڤبه ر،ل ناڤ ، د ناڤ
amoral , adj . نه سنجی
amoralism , n سه ر سه ریتی . نه سنجیتی
amoralist , n سه رسه ری
amorist , n ژنباز
Amorite , n , adj عه موری : یه ک ژ گه لێ که ڤنێ سامی
amorous , adj ئه ڤیندار
amorousness , n ئه ڤینداری
amorphism , n . بێ شکلیتی، بێ به لوریتی، بێ سه ر وبه ری
amorphous , adj بێ شکل
amortization , n . ده یندان ، ڤه کوشتن
amortize , v. t . ڤه دکوژیت
amortized , adj ڤه کوشتی
amortizement,n=amortiz ation
amortizing , n ڤه کوشتن
amount , v . i . دکت ، دبت

amount , n چه ندایه تی . مایه ، چه ند ، چه نده . تباب ، قاس
amour , n ئه ڤینکاری
amourette , n ئه ڤینکاریک
ampelopsis , n میوێتی
amperage , n هێزا لوزه وا که هره بی (ب ئه مپێران پیڤایی )
ampere , n ئه مپێر : لوزه‌و کو یه ک ڤولت دشێت دناڤ به رگری یا ئو مه کێرا ببورینت
ampere - hour , n ئه مپێر – ده مژ مێر
ampere - turn , n ئه مپێر – پێچ
amphi - پێشگره کو دو ته خلیته
amphibia , n جانه وه رێن به ژ ئا ڤی
amphibian , n , adj به ژ ئاڤی
amphibiology , n به ژ ئاڤیز انی
amphibiotic , adj به ژی ل قوناغه کێ ئو ئاڤی ل قوناغه ک دی
amphibious , adj به ژ ئاڤی ، ته روشکی
amphibiousness به ژ ئاڤیتی
amphiboles , n ئه مفیبول
amphibolic , adj ئه مفیبولی، شێلی . ئالوز، نه پشت راست
amphibology , n . ئالوزی : هه ڤوکا ئالوز یان شێلی
amphibolous , adj شێلی ، ئالوز
amphicarpic , adj دو به ر
amphigam , n زایه ند نه دیار
amphipod , n , adj پێ جوت
amphistylar , adj کاریته کری ژ هه ر دو ره خان
amphitheatre , n پێپکری ، ئه ردێ نشیڤێ پێپکری
amphitheatric , adj پێپکری یی
amphora , n که موله یێ که ڤنێ مه ی یان زه یتێ
ample , adj فراوان ، فره ، بوش ، زور، گه له ک ، پر ، زه حف، په له سنگ
ampleness , n په له سنگی ، زه حفی ، بوشایی . تێرهاتی
amplexicaul , adj باسک گرتی یان تێ ئالایی
ampliation . فراوانکردن ، فره کرن
amplification , n . مه زنکرن
amplifactory , adj درێژی : مه زنی، فره یی
amplifier , n گه وره که ر، گه ورک ، مه ز نکه ر
amplify , v . t . i . گ وره دکت ، مه زن دکت
amplitude , n مه ودا ، فره هی یا پێلێ ، فره وانی ، فره یی، به هایێ سه ری ( گوپیتکی)
- modulation , n فره یی شه قین
ampul or ampoule ,n ئه مپول: شوشه یێ قورته ک ده رمانی بۆ ده رزی لێدانێ ل بن چه رمی
ampulla شوشه ( گولاف ، مه ی ، یان زه یتا پیروز , هه بان
amputate , v . t . دبڕت
amputated , adj هلبراندی ، په کاندی ، راقه تاندی بڕی، تورکری
amputation , n تورکرن ، ژێکرن ، راقه تاندن ، په کین هلبراندن
amputee , n ده ست یان پێ بڕی
amuck , adv = amok به زینا بێ سه روبه ر
amulet , n نوشته ، ده ست به ند ، بازیه ند، نڤشتی
amuse , vt . که یف خوش دکت ، که یفێ دکت
amusement , n ڤه سهین ، ڤه سها ندن .که یف خوشی
-park باغچه یێ که یفێ
amusing , adj سه یر، که یف، گێره
amygdala , n باهیڤ
amygdalate , adj باهیڤی
amygdalin , n ئه میگدالین : گلوکوسیدێ دناڤ باهیڤا تالدا
amygdalic , adj باهیڤی
amygdaloid , n , adj باهیڤی : که ڤره ک کون کونی تژی نشته یێ کانان
amyl , n ئه میل : رها کحولی
amyl (o) - پێشگره کو نشایه
amylaceous , adj نشایی
amylase , n ئه میلاس : هاڤه ینا نشایی دکت شه کر دناڤ شێلاڤ ئو گلیزیدا
amyloid (al ) , adj نشایی
amylolysis , n گوهورینا نشایی بۆ شه کرێ
amylopsin ,n ئه میلوپسین : هاڤه ینه ک شێلاڤێ کو نشایێ دکت شه کر
amylose , n شه کرا به‌رامبه ر وه ک نشا ئو سلیلوزێ
amylum , n نشا
an,indef , artic., conj ئامرازا نه ناسکرنێ
an- پێشگره کو نه، بێ یه
ana , adv , n . وه ک یه ک ، ژ هه ر تشتی
anabaptism , n شوشتنڤه ، ئولا دیسان دشون

anabaptist , n باوه رمه ندێ نولا شوشتنڤه
anabas , n توخمێ ماسی یان کو ئاڤێ دهێلن ئو
ب سه ر داران دکه ڤن
anabasis , n پێشڤه چونا له شکه ری نه خاسمه
ئه وا کورشی کو زینوفونی ڤه گێرا
anabatic , adj سه ر ئه فراز بویی
anabolic , adj ئاڤاکرنی
anabolism , n ئاڤاکرن
anachronic , adj که ڤن
anachronism , n که ڤنی تی
anachronistic , adj که ڤن
anaconda , n ئه ناکوندا : ماره ک مه زنێ باشورا
ئه مریکا
anadem , n گولبه ند
anadromous , adj ژ ده‌ریایی سه رکه تی روباری بو
هێکرنێ
anaemia , n . = anemia زینده وه رێ بێ با
anaerobe , n زینده وه رێ بێ با یان نه بایی
anaerobic , adj نه بایی
anaesthetic ,n , adj په نج ، سرکه ر
anaesthetization , n بێ هشکرن ، په نجکرن
anaesthetize , vt په نج دکت ، بێ هش دکت
anaesthetized , adj په نجکری ، بێ هشکری
anaglyph , n نه قشێ کێم ده ر هاتی
anagoge or anagogy , n راڤه یا هوندوری یان گیانی یا ده قه ک
ئایینی
anagram ...., n . , vt گوهارتنا په یهاتی یاتیپێن په یڤه کێ بو
چێکرنا په یڤه ک نو، تیپێن په یڤێ
هوسا دگوهورن
angrammatize, vt =
anagram
anal , adj قونی
- bleeding . رسینا قونێ
- canal . کونکا قونێ
- vescicles plate . ده پێ قونێ
analgesia , n بێ ژ انی
analgesic , adj , n هه دارکه ر ، ژانکوژ
analogic, adj پیڤانی ، هاوتا ، هه ڤ تا
analogous , adj وه ک ، هاوتا، هه ڤ تا، هه ڤ رو،
هه ڤتایی
analogue , n هاوتا ، قام ، هه ڤ تا ، هارا، هه ڤ
رو ، به رنیل
- computer , n خوژمێرا پیڤانی
analogy , n هاوبه‌کی ، پیڤانا نمینه‌نده‌ری، هاوتایی
وه کیه کی ( پارچه کی )
analphabet , n نه خوه ندا، نه‌خوه ندی، نه خوه‌نده وار

analysand , n ده رونی شیته لکری
analyse , vt = analyze .
analysis , n شیته لکردن ، شیکردن ، شیکاری ،
کورتی، هه ڤوک سازی ، شیته ل
شیکرن ، ژێکڤه کرن ، شیکرنه وه
analyst , n شیته لکارێ ده‌رونی،شیته لکار ،
شیکار ، شیڤان
analytic , adj رێزمانی ، شه هره زا بشیته لکرنێ ،
شیته لی، شیکاره کی
analytical , adj ژمارتنی
- analysis ژمارتنا شیته لیزانی
analytics , n . شیته لی یا ژیر بیژی ، ئه ندازیاری یا
شیته لی
analyzable , adj شیته لبار
analyzation , n شیته ل
analyze , vt . رێز مانی شی دکت . شیته ل دکت
شی دکت
analyzer , n شیکار
anamnesis , n بیرکرن . دیروکا نه‌ساخی
anamorpha , n سی پێ ، سه‌ پێ
anamorphosis , n فراژو ، وه رار
ananas , n = pineaple
( also anana )
anandrous , adj بێ نیرک
Ananias , n دره وکه ر
ananthous , adj بێ گول . نه گولی
anapest , n پیڤه ک هوزانێ یه
anaphase , n قوناغا جودابونی ( ناڤکا خانه یێ )
anaphora , n دوباره‌کرنا بێژه‌یه‌کێ ل سه رێ
دو هه ڤوک یان مالکێن ل دوڤ یه ک
anaphrodisia , n بێ یان کێم هه وه سا گانکرنێ
anaphrodisiac , adj نه هێلان یان کێمکه‌رێ هه وه سا
گانکرنێ
amaphylaxis , n هه ستیاری یا بێقام دژ پروتینا بیانی
anaplasty , n = plastic
surgery .
anapsid ,n کلوخێ بێ لاجان
anarch , n رێبه رێ ئاژاوه گێر ، ئاژاوه گێر
anarchic , adj بێ یاسایی : ئاژاوه گێری
anarchism , n ئاژاوه گێر یتی : دیتانه یا کو هه مو
ده ست هه لاتی یا حکومه تێ خرابه
anarchist , n , adj ئاژا وه گێر، بێ یاساخواز
anarchistic , adj ئاژاوه گێری
anarchy , n شێل وێل ، ئاژاوه ، بێ ده ست
هه لاتی یا حکومه تێ
anasarca , n ئاڤ به ندا له شی
anastigmat , n نیسکه یا راستکه ر (دیتن)

| | |
|---|---|
| anastigmatic , adj | راستکه ری |
| anastomosis , n | تور یه کبونا دەمارێن خوینێ ، تیک ئالینا چق یان رهان، ڤیکەتن یان توربونا نو هیلان یان رۆباران |
| anastrophe , n | ڤاژیکرنا ریکخستنا ئاسایی یا په یڤێن هه ڤوکی |
| anathema, adj , n | که مباخ، نفرین . نفرینکری |
| anathematize , vt | نفرین دکت |
| anatidae , n | قازه کی |
| Anatolian , n , adj | ئه ناتولی |
| anatomical , a , adj | که لشینی |
| anatomist ,n | که لشینکار ، نه شته ر باز |
| anatomize , v . t . | شروڤه دکت |
| anatomy ,n | ڤه که لشتن . که لشتن . که لشینزانی ، نه شته ریازی |
| anatropous , adj | ڤاژی یا هیکێ |
| anbury ,n | پوفی یا نه رم یا هه سپ ئو گایان |
| - ance . | پاشگره کو کاره ، کرداره |
| ancestor (s) , n | پێشینه ، ئیجاخ . بابکالک . بًاب و باپیر، باپیر |
| ancestral , adj | بابکی . باپیری |
| ancestry , n | بنه مال ، بنه ماله ، پێشینان ، باپیر ، پێشین ، بابک |
| anchor , v . t . i | له نگه ردکت |
| anchor , n | گرانی ، له نگه ر |
| - at ...... | له نگه رکری |
| - to cast ( drop)....... | له نگه ر دکت |
| - to weigh ..... | له نگه رێ رادکت بۆ ده رکه تنێ |
| anchorage , n | له نگه ر گرتن . له نگه ر گه ، به نده ر |
| anchored , adj | له نگه ر ماڤێتی |
| anchoress ( also ancress), n | ره به ن : مێ |
| anchoret , n (also: achorite ) , n | ره به ن |
| anchoring , n | له نگه ر گرتن |
| anchovy , n | ئه نکوڤی : ماسی یه ک بچوکه |
| ancient , adj , n | شونواری ، که ڤناره تی . که ڤناره ، که ڤن |
| anciently , adv . | به رێ ، ب که ڤنی |
| ancientness , n | که ڤناتی |
| ancilla , n . | به رمالی ، هاریکه ر |
| ancillary , adj | هاریکه ر |
| ancipital , adj | دوسه رک |
| ancle = ankle . | |

| | |
|---|---|
| ancodonta , n | دوسمم |
| ancon , n | ئه نیشک |
| - ancy | پاشگره کو باره |
| ancylostoma , n . | موماره |
| ancylostomiasis , n | کێم خوینی یا دژوار |
| and , conj | ئو |
| - so on | ئو هه ر هوسا . |
| - so forth | ئو هه ر و ه سا |
| Andalusian , adj , n | ئه نده لوسی |
| andante , adv . adj , n | هێدی یا ئاڤی . ئاڤێن یان برگه یا هێدی یا ئاڤێن |
| andiron ,n | ئاسنێ به رپا لکێ دارێن ئاگری |
| andradite , n | به ره ک هێژا |
| andr (o) - | پێشگره کو مروڤه ، نێره |
| androecium , n | ئه ندامێن نێرکێن هه له زی |
| androgen , n. | نێراتی خور تکه ر |
| androgynous , adj | ژنانه، نێره موک |
| android , adj | مروڤێ ئامێرگه ر . مروڤی |
| anear,adv.,prep.=near | |
| anecdotage , n | چیروک بێژی |
| anecdotal, adj | چیروکی |
| anecdote , n | جڤانوک . چیروک |
| anelectric , adj | نه که مره بی |
| anem(o) - | پێشگره کو بایه |
| anemia ,n | بێ خوینی ، کێم خوینی |
| anemic , adj | کێم خوین |
| anemograph , n | باپیڤ |
| anemography , n | باپیڤی |
| anemology , n | بازانی |
| anemometer , n | باپیڤ |
| anemone , n . | کولیلکا نیسانێ ، بۆک و زاڤا ، . گونگلوک ، نیسانی |
| anemophilous , adj . | با په یین |
| anemophily , n | په یینا بایی |
| anemoscope , n . | بابین |
| anent , prep . | ژ، سه باره ت ، ل سه ر، ل بابه تێ |
| aneroid , n | په ستان پیڤا بایی |
| anesthesia , n | سربون ، بێ هشی |
| anesthetic , adj , n | سرکه ر – ته زاندن، بێ هشکه ر |
| anesthetist , n | بێ هشکه ر |
| anesthetize , v . t | بێ هش دکت |

anesthetized , adj بێ هشکری
aneurysm or aneurism , n دریژ بونا ده مارێن خوینێ
.anew , adv . ژ نۆ
anfractuous , adj چه پ و چیری . بادایی
angary , n مافێ دەوله تا شه رکه ر کو سامانێ
ده وله تێن نیتار داگیر بکت ئو ب کاربینت
angel , n . فریشته
- of punishment زه بانی
angelfish , n . ماسی یا شاپه روه ک چه نگان .
ماسی یه ک ده فه را یه کسانه که ری
شاپه ر لرک، ماسی یا فریشته یی
angelic (al ) adj فریشته یی
angelica , n گیایێ فریشته یی
Angelus , n نفێژا مزگینی یێ ، زه نگلا مزگینی یێ
anger , v . t . i ئه نرک ، ئه نرینت
anger , n خه یدین ، هیرس . گه روشه ، ئه نر ،
خورین، ئه نگری ، خشم ، ئه نرین
angered , adj ئه نراندی
angering , n توراندن، سلکرن . ئه نراندن
angi (o) - پێشگره کو ئامانه
angina , n سینگ کوتان ، سینگه کوژی . دل ئێش
-pectoris ژانه دل، سینگ کوتان ،دل ئێش، دل
ره نجی
angiology خوین یان لمف ده مارزانی
angioma , n په ژ بونا ده ماری
angiosperm , n توف قه پوچکی
angiospermous, adj ژتوف قه پوچکی
angle , n کونج . کاش، گوشه، قلچک شوکا
ماسی یان
- of attack گوشه یا هاتنێ
- of contact گوشه یا لیکه تنێ
- of depr ession گوشه یا نزمبونێ
- of elevation گوشه یا بلندبونێ
- of friction گوشه یا لیکخشانێ
- of incidence گوشه یا که تنێ
- reflection گوشه یا هه لگه رانێ
- of refraction گوشه یا شکاندنێ
angled , adj گوشه کری
anglei ron ئاسنێ گوشه یی
angler , n ماسیڤان، ماسیگر
angleworm, n.
=earth worm
Anglican , a , n ئنگلیز . ئه نگلیکانی : ئه ندامێ دێرا
ئنگلیزی

Anglicism , n سه ره تایێن رامیاری یێن ئنگلیزی
زاراڤێ یا ئنگلیزی
Anglicist , n زانایێ زمان ئو توریێ ئنگلیزی
Anglicization , n. ئنگلیز کرن
Anglicize, v t i ئنگلیزدکت
Anglicized , adj ئنگلیز کری
Anglicizing , n ئنگلیز کرن
anglify,vt=Anglicize
angling , n گوشه کرن، ماسیگرتن ( ب شوکێ )
Anglo پێشگره کو ئنگلیزه
Anglomania , n ئنگلیز خوازی
Anglophil (e ) , n . ئنگلیز خوازی
Anglophobe , n کینداریێ ئنگلیزی
Anglophobia , n کینداری یا ئنگلیزی
angora , n که ژ
- kid که هرک
angostura , n تیقلێ تالێ داره ک باشورا ئه مریکا
وه ک قایمکه ری ب کار دئینت،
شه رابا مه ستکه را ڤی تیقلی
angrily , adv . ب ئه نرینی
angriness , n ئه نرینیتی
angry , adj خه یدی ، سل، توره، رژترش ،
دلپر، دلمایی ئه نری
angst , n ترس . بزدهین .په ریشانی . هه ژ ڤین
angstrom unit , n یه که یا ئه نگستروم
anguilliform , adj وه ک مار ماسی
anguine , adj وه ک ماری
anguish , n دل گرانی ، مروس ، مروچ . مروز
، شکه نج . ده ردمه ندی ، ئازاری ،
ئارمان، ژان ئێشا دژوار ، چه ڤا
anguished , adj خه مدار
angular , adj گوشه دار، گوشه یی
- acceleration گوری یا گوشه یی
- bone هه ستی یێ گوشه دار
- momentum ته وژما گوشه یی
- velocity . له زا گوشه یی
angularity , n گوشه یی تی
angulate , adj گوشه یی
angulation , n . گوشه کرن
angusti – پێشگره کو ته نگه
angustifoliate , adj به لگ ته نگ
anhimidae قازا قیژکه ر
anhydride , n ئه نهاید راید : پیکهاتی یێ بێ ئاف

**anhydrite , n** ئه نهایدرایت : کبریتاتین بێ ئاڤا کالسیومی
**anhydrous , adj** نه ئاڤی
**anhingidae , n** قوانک
**anil , n** هه ش ره نگی (شین) . هه ش
**anile , adj** پیره ژنی
**anilin (e) , n .** ئه نیلین : ئاڤه کی یا زه یتی یا ژه هری کو ژ قه ترانا ره ژی یێ دئێت ده ر ( بۆ چێکرنا بویه ئو گولاڤان )
**anility , n** بێ مه ژ ی ، خورفین
**animadversion , n** ره خنه . گازنده
**animadvert , v . i** گازنده دکت، ره خنه دکت
**animal , n . adj** لاور ، ده هبه ، ته به ، قوش . ته رش . جانه وه ر ،ده وار ، گیانه وه ر ولاخ
- open pen مه خه ل
- pen پاوان
- skin or hide که ڤل
- starch نشاسته یا گیانه وه را
- tracks تا
- womb کاردانک
**animalcular , adj** جانه وه ر کی
**animalcule , n .** جانه وه رک : جانه وه رێ هور بینی ( کو ب چاڤان نائێت دیتن )
**animalculum , n= animalcule**
**animal heat , n .** گه رمی یا ( له شێ ) جانه وه ری
**animal husbandary , n** چاندنا جانه وه ری :خودانکرنا ته رشی
**animal - tax , n** کوده
**animalism , n** چالاکی یا ده واری ، چالاکی یا گیانه وه ری
**animality , n** ده هبه یی
**animalization , n .** جانه وه رکرن
**animalize , vt .** جانه وه ر دکت ، ده وار دکت
**animally , adv** ب ده واری ، ب له شی
**animal magnetism , n** مه غنه تیزیتی یا جانه‌وه‌ری ، نڤاندنا مه غنه تیزی
**animal spi rits** چالاکی یان گیانی یا لاوان
**animate , adj** زندی . چالاک . ژیندار
**animate , v , t .** چالاک دکت ، دڤه ژینت
**animated , adj** ژیندار ، چالاک
**animated cartoon , n** وێنه یان کارتونێن ڤه کی
**animating , n** ڤه ژیاندن ، زندیکرن ، ژیان ، چالاکی . کارتونێن ڤه کی .
**animation , n** ژیاندن
**animator, n** چێکه رێ کارتونێن ڤه کی
**animism** گیانکیتی : ئولا دبێژت کو هه ر تشتێ مادی گیان هه یه
**animist , n** گیانی
**animistic , adj** گیانی یی
**animosity ,n** دوژ منی ، دژ منی
**animus , n .** هه وه س ، نیاز، دوژ منی
**anion , n** ئه یون ( بارگه نه یێن )
**anis (o) -** پێشگره کو تێڤه‌له ، جیاوازه
**anise , n** رزیان
**aniseed , n** رزیان ، هه بوسان ، توڤێ یانسونی
**anisette , n** شه رابا رزیانکی
**anisogamous or anisogamic , adj** تێڤه ل زایه نده
**anisogamy , n** شوکرنا تێڤه ل زایه نده یان
**anisomerous , adj** ( گول ) په ر نه یه کسان
**anisometric , adj** پارچه تێڤه ل، پارچه نه رێک
**anisometropia , n** تێڤه لی یا مه ودایێ چاڤان
**anisotropic , adj** تێڤه ل دار ، تێڤه ل تایبه خو .
**ankerite , n** ئه نکه رایت : که ڤرێ تێر ئاسن
**ankh , n** خاچا وه ک تیپا (T)
**ankle , n** پاژنه . گوزه ک
- bone گوزه ک ، ده ق ، قاپ
**anklet , n** خرخال ، بازنێ پێ، حجول
**ankylose,vi.** موڵک ره ق دبت
**ankylosis , n** موڵک ره ق‌بون
**anlage , n** خواز ، هه وه س
**annalist , n** دیروکڤان . سالنامه ڤان ، مێژو نوسه ر
**annalistic , adj** سالنامه یی
**annals , n** تومارێن دیروکێ ، دیروک ، سالنامه
**anneal . v . t .** شوشه گه رم دکت داکو ره نگان چه‌سپان‌بکت، نه رم دکت (ب گه ر مکرنێ پاشی سار کرنێ . ره ق دکت ، قایم دکت
**annelid , n , adj** کرمێ خه له کی
**annelida , n** کرمێن خه له کی
**annex , n** راپێچه ک
**annex , v . t** داگیر دکت . دبه ردت سه ر
**annexation , n** راژێر کرن . گرتن
**annexational , adj** راژێر کرنی
**annexed , adj** گرتی . راژێرکری
**annexing , n** گرتن
**annexment , n** پاشکو ، دوڤ
**annihilable , adj** ڤه لێنبار ، برهێنبار
**annihilate , vt .** قربکت ، ڤه لاچو دکت . دبرهێنت ، دڤه لێنت ، دبرت
**annihilated , adj** ڤه لاچوکری ، برهاندی
**annihilating , n** برهاندن
**annihilation , n** ڤه لاچو، نه مان، قوتبرین، نه هێلان، قرکرن ، برهاندن ، ڤه لاندن
- radiation تیرێژا نه مانێ

annihilator , n برهینکه ر
annihilatory, adj برهیندار
anniversary , n , adj سه رسالی . سه رسال ، سالانه
annotate , vt , په راویز دکت ، تیبینی دکت ،تیبینی ددت
annotated , adj په راویزکری ، تیبینیکری
annotating , n تیبینیکرن، په راویزکرن
annotation , n . تیبینی ، په راویز . په راویزکرن
annotator , n په راویزکار
announce , v . t . i راگه هینت ، ئا گه دار دکت
announced , adj راگه هاندی
announcement , n جاړدان ، راگه هین ، راگه هاندن
announcer , n ئا گه دارکه ر
announcing , n راگه هاندن
annoy , n , v . t . i . ئه زراندن ، سلکرن
دئه زرینت ، سل دکت
annoyance , n . بیزارکرن، پندرن وه ره زبون، وه ره ز عاجزکرن ،سلکرن، توره کرن ، جارسکرن،
ئازار ، ته نگا فکرن
annoyed , adj زیز ، جارس ، سل
annoyer , n شه پرزه که ر
annoying , n جارسکرن ، وه ره زکرن ، سلکرن
annual , adj , n ساللە گه ر ،سالنامه ، هه رسال، سالانه
- budget بوجه ی سالانه
- tax سالیانه
- wage سالانه
annualize , vt . سالانه دکت ( هه ژ مارتنا به ره مه مي
annualized , adj سالانه کری
annualizing , n سالانه کرن
annually , adv سالانه یی
annualing , n خه له کا سالانه ( دار )
annuitant , n وه رگری دانا سالانه
annuity , n دانا سالانه
annul , v . t هه لوه شینت ، رادکت
annular , adj خه له کی ، بازنی ، ئه لقه یی
- eclipse روژیان هه یف گرتنا خه له کی
annulate (d) , adj خه له ککری ، بازنکری
annulation , n خه له ک چیکرن ، خه له ک
annulet , n بازنک
annulled , adj هه لوه شاندی
annuling , n هه لوه شاندن
annulment , n هه لوه شان
annuloid , adj وه ک بازنی
annulose , adj وه ک خه له کی
annulus , n چه مبه ر
annunciate , v . t . رادگه هینت ، ئه شکه را دکت
annunciated , adj راگه هاندی
annunciating , n راگه هاندن
annunciation , n ئه شکه راکرن ، ئاگه هی
annunciator , n ئاگه هکه ر
annus mirabilis , n ساله ک دیرینه یان نیشاندار
anobalism , n درستکاری
anodal , adj پیوه ندیداری ئه ریني ( جه مسه ر )
anodally , adv ب ئه ریني
anode , n ئه نود : جه مسه ری ئه ری یی
به رزه ک ، ئه ریني
anodic , adj پیوه ندیداری ئه ریني
anodically , adv ب ئه ریني
anodize , vt ئه نود دکت :ئه لومنیومی ب چینه ک ژ ئوکسیدی ئه لومنیومی دهنت
anodized , adj ئه نودکری
anodizing , n ئه نودکرن
anodyne , adj , n ده رمان ( بو ئه هیلانا ئیشی )
anoint , v . t . دادمه زرینت(ئولداری ).مه لحه م دکت ، دبه رخینت ، رون دکت
anointed , adj په رخاندی ،مه لحه مکری ، رونکری، دامه زراندی (ئولدار )
anointer , n رونکه ر
anointing , n تیدان ، په رخاندن
anointment , n دامه زراندن ( ئولدار ) ،
مه لحه مکرن، رونکرن . په رخاندن
anomalistic , adj پیوه ندیداری ئه ریکی یا ستیران
anomalous , adj ئه ژی ، لوق ، ناویژه ، ناسایی ،
گروچ ، نه ئاسایی، نه ریک
anomalously , adv ب نه ر یکی
anomalousness , n نه ریکیتی
anomaly , n نه ریکی
anomonoma , n ریسپه ر
anomodontia , n خشوکا نیف شیردار
anomapoda , n کیچا ئالی
anomura , n ده هـ پی
anon , adv نیزیک ، ده مه ک دی ، جهدا . ده م وده ست ، زو
anonym , n پا چ نا ف ، نا ف نه زان، بی ناف
anonymous , adj نا ف نه زانی، بی نالی
anonymously , adj ب بی نالی ، ب که سنه زانی

anonymousness , n — که سنه زانیتی، بیَ ناڤیتی
anoplotheriidae , n — سیَ سم
anorexia , n — دل نه چونا خوارنیَ
anorthite , n — ئه نور تایت : فیلسپاریَ سپی ، سور یان به رگه وریڤه دناڤ که ڤرین برکانیدا
anosmia , n — بیَ سه حکرنا بیَهنیَ
another , adj., pron. — یه ک دی ، ئیَکه دی
- time — جاره ک دی
- love one .. — حه ز ژ هه ڤـ بکن
anourous , adj — بیَ دوف
anovulant , n — ده رمانیَ بژهیَکبونیَ
anoxemia , n — ئه نوکسیمیا : نه ئوکسیدبونا خوینیَ
anoxia , n — ئه نوکسیا:کیمبونا ئوکسجینا ته ڤنیَ له شی
Anseres , n — توخمیَ قاز ئو وه رده کان
anserine , adj — وه رده کی
answer , n , v . i . t — پاسوخ ، وه لام ، به رسڤ، وه لام ددت ، به رسڤ ددت
answerable , adj — به رپرسیار
answered , adj — به رسڤکری
answerer , n — به رسڤکه ر
answering , n — لیَ ڤه گه راندن، به رسڤدان
ant, n. — گیل ، میَری ، میَرو
- eater — میَری خوه ر
- hill — مورستان
- 's nest — کزیَ میَری یان کز، کون میَری
ant = anti — دژ
anta , n — کاریته بیَ ل هه ر دو ره خیَن ده ریکی
antacid , adj , n — دژ ترشی
antagonism , n — نهیَله ت ، دژ منی ، کین، دژی ، دژایه
antagonist , n — دوژمن، نه یار
antagonistic , adj — نه یار
antagonistically, adj — ب نه یاری
antagonize , v . t . — نه یاربکت
antagonized , adj — نه یارکری
antagonizing , n — نه یارکرن
antalgic , adj , n — هه دار . ده رمانیَ ژان کوژ
antalkali , adj — دژ قلیَ
antarctic , adj , n — ژ ده ڤه را باشورا جه مسه ری
Antarctica , n — زه ڤی یا بیَ خه لک ل دور ویه ریَن جه مسه ریَ باشور
- circle , n — جغز یان چه مه ره یا جه مسه ری یا باشوری

Antares , n — دلیَ دوپشکی ( ستیَرزانی )
ant bear , n . — هرچا میَری یان : جانه وه ره ک ئه مریکانی مه زن میَری خوره
ante , n — گره وا ( له یزتنا پوکه ریَ ) به ها
ante , vt , i — گره وبکت به ری کاغه زیَن خو ببینت
ante - — پیَشگره کو به ریَ یه ( ده م ئو در ) پشکا خو ددت . ( دراڤ ) ددت .
antebellum , adj — به ری شه ری
ante - brachium ,n — زه ند
antecede , vt . — به ری دنیَت، پیَش دکه ڤت
antecedence , n — پیَش ده ستی ، به ری
antecedency , n — به راهی
antecedent , adj , n — به ر ، به ری
antechamber , n — به رڤلد
ante date , n , v . t . — دیروکا پیَشکه تی به ری ده می، ( به ری ده می ) دیروک دکت ، زوتر دکت ، پیَشڤه ببت
antediluvian , n , adj — به ری ده میَ توفانیَ
antefix , n — خه ملا ئاڤاهی
anteflexion , n — پیَش چه مین ( پزد انک )
antelope , n — گاگولی ، ئاسک ، په زکوڤی
antemeridian , adj — سپیَده یی
antemortem , adj — به ری مرنیَ
ante mundane, adj — به ری بونا گه ردونیَ
antenatal , adj — پزی ، به ری بونیَ
antenna , n . — بارایه ل ، هشکه ر ، هه وایی
antennule , n — شاخکیَ سه حکرنیَ
antenuptial , adj — قه ومینا به ری شوکرنیَ ، بونا به ری ژن ئینانیَ ، بیژی
antependium , n — نخاڤا پارچه یا به راهی یا قوربا نگه یێ
antepenult ( ima ), n — برگه یا سیَیه ما به ری دوماهی یا په یڤه کیَ
anteprandial — به ری فراڤینیَ
anterior , adj — پیَشینه ، ل به ر به ر ی
anteriority , n — به ریتی، پیَش ده ستیتی ، به راهیتی
anteroom,n= antechamber
anthelmintic , adj , n — ده رخستنیَ کرمیَن روڤیکا ، ده رمانیَ ده رخستنیَ کرمیَن روڤیکا
anthem , n — ستران ، سرود
anthemion , n — خه مله ک وه ک گولیَ یه

anther , n پارچه یا نێرکێ یه یێن تێدا
antheral , adj پارچه یی یا نێرکی
antheridial , adj نێرکی ( نه گولداران )
antheridium , n نێرکێ نه گولداران
anthesis , n له بونا گولێ یان ده مێ له بونێ
antho - پێشگره کو گوله
anthocyanin , n بویه یه ک ناڤ شیرینێ خانه پیدا کوبه لگان ئو گولان شین ئو سور دکت
anthologist , n کومکه رێ هه لبژێر
anthologize , v . t کوم دکت ( بژاره )
anthologized , adj بژاره کری
antholo gizing , n بژاره کرن
anthology , n پارچه تور و هوزانێن هه لبژارده . که شکول ، به رهه فوک
anthophagous , adj گول خوه ر
anthophilous , adj گول خوه ر یان خواز
anthophore , n هه لگرێ تاجکێ
anthotaxy , n رێکخستنا گولی یا ئیشی یا گولێ
anthracene , n ئه نتراسین :ماده یه‌ک هایدر وکاربونی یا قه ترانا ره ژی یێ
anthracite , n ره ژی یا ئه نترا سایت : کومر ، ره ژو . ره ژی
anthrax . n تایا ته رشی ، پرزک
anthrop (o) - پێشگره کو مروڤه ، مروڤی یه
anthropocentric, adj مروڤ نیڤه کی
anthropogenesis , n مروڤزانی
anthropography , n ئه نتروپوگرافی : مروڤ راڤه زانی
anthropoid , adj مروڤی
anthropoidea , n . pl. or anthropoid apes , وه ک مروڤی
anthropologist , n مروڤزان . ره گه زناس
anthroplogy , n ره گه زناسی . مروڤناسی ، مروڤزانی
anthropometry , n مروڤزانی یا پیڤانا له شێ مروڤی
anthropomorphic,adj له شدار
anthropomorphism, n له شداریتی :راڤه کرنا خودایی وه ک مروڤی
anthropomorhpize , vt , i له شدار دکت
anthropomorphosis , n مروڤبون
anthropophagous , adj ژخوه رێ گوشتێ مروڤی
anthrophagus , n خوه رێ گوشتێ مروڤی
anthroposophy , n ئاینه ک وه ک خودازانی

anti پێشگره کو، دژه به رگره، دوژمنه ، زر، فاژی، ناکوکی یه
- acid , n به رگرێ ترشی
- aircraft , n دژ بالافر . به ر - بالافر
- anxiety , adj دژ - په ریشانی
- ballistic missile , n دژ موشه کا بالستی
-biosis , n دژایه تی ئاڤیه را دو ئه ندامان کو یه ک زه ره مێ دبت
- bilious , n دژ - زه ردافی
-biotic , n زینده دژ ، دژه زینده کان
- body , n دژه له ش ، دژه ته ن
- decomposition به ر گه نی
- rot به رگه نی
- small pox به ر خوریک
antic , adj , n گێره ، رزرته ک ، ئه تیکه
anticatalyst , n نه هانده ر : ماده یێ کارلێکرنا کیمیایی گیرودکت
anti - christ , n دژعیسا : ده جال
anticipate , vt ده بینی به ری ده مێ ددت . ل به ره بیت . ل به ر دبت
anticipation , n رابینین - چاڤنهێری ، پێژین . ل به ر بون . ل به ره،سوسه کرن
- thanking you in ... سپاس ل به راهی یێ
anticipative , adj هیڤی خواز
anticipatory , adj هیڤیداری
anticlerical , adj دژ سه رده ستی یا ئولداری
anticlimax , n دژ مه زنی
anticlinal , adj کوڤزی
anticline , n پێچا کوڤزی
anticlockwise چه په خول
anticoagulant , n به رگرێ ( نه هێلێ ) خوین مه یینێ
anticyclone , n بابه لیسک
antidotal , adj به رگرێ ژه هرێ
antidote , n . ده رمانێ دژی ژه هرێ
antielectron , n دژ - ئێلێکترون ( پوزیترون )
antiferment , n دژ - ترشبونێ
antifertility , adj دژ - ئاڤسبون
antienzyme , n دژه ئه نزیم
antifreeze , n دژ - قه رسین، دژ - به ستن
antigen , n دژه درستکرن
antihelix , n په رێ گوهی
antiknock , n به رگرێ قوتانا مه کینه یێ

saffron, n , adj , v. t زه حفه ران ، ب زه حفه رانی ره نگدکت ، وه ک زه حفه رانی ره نگ دکت
- cake کلوچا زه حفه رانی
- coloured ره نگ زه حفه رانی
saffrony , adj زه حفه رانی
safranine , n ماده یێ ره نگکه رێ زه حفه رانی ، سورێ زه رێ ڤه ترانی یێ زه حفه رانێ
safrole , n سافرول : ئاڤه کی یه ک بێ ره نگه ( بۆ گولاڤان ب کار دهێت )
sag , n , v . i . t شوربون . داهێلانا ره خه کی ، کێمبونا به هایی . سستبون شوربت ، دادهێلت . سست دبت
saga , n چیروکا تێر کارێ ڤه هره مانی‌داستان
sagacious , adj وریا ، چاڤ بێل ، بیره وه ر . بیربر ده گه ل .هشیار . زیره ک . زێن . ژیر
sagaciously , adv ب ژیری
sagacity , n هشیاری تی ، ژیری تی
sagamore , n = sachem
sage , n گیاکێ بێهن خوه ش به لگ گه ور – که سک ( به لگ لێنا نداری )
- brush شینکا تی یا تفتی ل هنده ک ده ڤه رێن به یارێن ویلایه تێن یه کگرتی یێن ئه مریکا
- cheese په نیرێ ئه ڤ گیا تێکلکری
- cock که له شێرێ ڤان ده ڤه ران
- green ره نگێ به لگێن گیاکی
- grouse بالنده مریشکی یا ڤان ده ڤه ران
- hare روڤی یێ ڤان ده ڤه ران
- leaves به لگێن گیاکی
- tea ده رمانێ ل گه ل گیاکی تێکلکری
sage , adj , n په ندیار . زانا . هشدار . ژیر، هوزاک
sageness , n په ندیاریتی
sageship , n په ندیاری
saggar , n قالبێ گلی بۆ په حتنا کالوتی
sagged , adj شور ، مرتاندی ، داهێلایی
sagging , n مرتاندن . مرتین ، داهێلان . شوربون

sagitta , n تیر
sagittal , adj تیری . وه ک تیری
sagittarius , n برج (نیشانا نه‌هه‌ما چه‌رخا برجان ) ، تیر ئو که ڤان . تیرباز . که ڤانه ڤان
sagittate (ated) , adj وه ک سه رتیری . تیری
sago , n ئارێ نشایی یێ ئافکا دار ڤه سپێ ساگویی
- palm دارڤه سپێ ساگو ( ل هندستانێ ئو مالیزیا )
saguaro , n هه له زا ( کاکتوس ) یا مه زن
sagy , adj گیاکی
sahara , n سه حرایا مه زنا لیبیا
saharan , adj سه حرایی
saharian , adj سه حرایی
saharic , adj سه حرایی
said , (p of say) گوت
said , (pp of say ) گوتی
saiga , n په زکوڤی
sail , n هێله کان . په رده دار . بابره ک
- boat گه می یا هێله کانی ، باگه می ، که شتی با
- cloth په روکێ بابره کی
- in ..... ل گه می یا بابره کیدا
- to make ...... ده ست ب رێویتی دکت
- to set ....... ده ست ب رێویتی دکت
- under ..... بابره ک ڤه کری
- vessel گه می یا هێله کانی
sail , v . i . t ده ست ب رێویتی دکت
- to .....in چالاک کاری ده ست پێدکت
- to ......into ئێریش دکت . ره خنه دکت
sailable , adj ده ریابار
sailer , n باگه می
sailfish , n ماسی‌یه‌ک مه‌زنه ( شاپه‌را پشتێ بێقام مه زنه )
sailing , n باڤانی ، که شتیکرن . گه میڤانی
- boat باگه می ، به له ما چاروکه دار

- ship باگه می ، باکه شتی
- vessel باکه شتی
sailor , n گه میڤان . ده ریاگه ر . ده ریاڤان ، که شتیڤان
- a bad ...... ده ریاگه ریّ گیژبیت
- a good ...... ده ریاگه ریّ گیژ نابت
- 's choice , n بژاریّ ده ریایان
sailplane , n بالافرا بابره کی ( بیّ مه کینه )
sain , vt پیروز دکت . خاچ دکت ( ل سه ر سینگی )
sainfoin سه نفون : هه له زه ک گول قه ره نفه لی
saint , adj , n , vt پیروز . پیر ، پیروز دکت
saintdom , n پیروزیتی
sainted , adj پیروزکری
sainthood , n = saintship
saintliness , n پاکی ، پیروزیتی
saintly , adj پاک
saithe , n ته خلیت ماسی یه ( چه رم تلان ره ش دکت )
sake , n به رژه وه ندی . مه به ست . ئارمانج . خاتر
saker , n باز (سه قریّ عه ره بی)، لاچین ،هه لو
saki , n ته خلیت مه یمونه
sal خویّ
- for your .... بو خاترا ته
salability , n فروشباری
sal(e)able , adj فروشبار
salacious , adj هار ، به لقتی
salaciously , adv ب هاری
salaciousness , n هاری تی ، به لقتین
salad , n زه له ته
- days رِۆژێن هولی ییّ
- dressing ئیخنی یان سوسا زه له تیّ
salade , n = sallet
salamander , n ته خلیت کمکمه ( ژ خوله دناف ئاگریدا دژیت ) . ئاسنیّ گه رمیّ سور بو توپ هاڤیتنیّ (باروتیّ)
salamandrian , adj= پیوه ندیداریّ ئاسنیّ گه رمیّ سور
sala mandreine
salamandroid,adj , n کمکمه یی
salami , n ته خلیت سوسه ج : روفیکا ب قیمه یی داگرتی
sal - ammoniac , n نوشاتر
salangane , n چیچکا هیّلینا خوارنبار چیدکت
salariat , n موچه خوه ر
salaried , adj موچه کری
salary , n مانگه . موچه
- cut موچه بری
sale , n فروتن
- for ...... بو فروتنیّ
- on...... بو فروتنیّ
- of work بازاریّ خیّرخوازی
- 's man فروشیار
- 'smanship فروشیاریتی
- ring خه له کا کری یاران ل هه راجیّ
- s'woman فروشیار ( ژن )
salep دانیّ خوراکی یان نشایی ژ باسکیّ هه له زیّ ئور کدی
saleratus , n بایکاربونیتا پوتاسیوم یان سودیوما نه بژین ( بو تورزا په حتنیّ )
sale's resistance , n به رگری یا فروتنیّ ، مه ژی ره قی
sali پیشگره کو خویّ یه
salicet , n ته خلیت ئورگه ن
salicin , n سه لسین : پیکهاتییه ک سپی تال به لوری.(ده رمانه بو هه دارکرنا تاییّ)
salicional , n ته خلیت ئو رگه نا ده نگ نه رم
salicyl , n سالسیل
salicylate , n , vt سالیسیلیت . سالیسیلیت دکت
salicylic, adj سالیسیلیک
- acid ترشی یا سالیسیلیک
salicylism, n سالیسیلیتی
salicylize , vt سالیسیلیتی دکت
salicence , n خالک یان نیشانا به رزبتشت یان پارچه یاده رهاتی ، به رزایی ، قزک، لیتک

silencely , adv به رزایی یه کی ، ب به رزایی
saliency , n به رزایی . قزک . لیتک ، ده ر هاتی. نیشانا به رز
salient , adj , n دیار ، به رز . هه نده ف
salientation , n به رزبون ، قول
salientian , n , adj بازده ر ، جانه وه ریٰ بازده ریٰ به ژنالی وه ک به قیٰ
saliferous , adj ( چینا ئه ردیٰ ) تیر خویٰ
salify , vt خویٰ دکت . دکت خویٰ
salimeter , n شور پیف
salina , n شوره زار ، سیر . شور
saline , adj , n سیر . شور . شوراف . شوراو ، سور . سویر
salinity , n سیری . سویری . شوره ، شوری ( ئاف ئو خویٰ )
salinization , n شوریکرن
salinize , vt شوری دکت
salinized , adj شوریکری
salinizing , n شوریکرن
salinometer , n = salimeter
saliva , n لیک . توک ، تف ، گریژ . گلیز . گلیزیٰ ئاڤاده ڤی ، خوزاف . لیکاو
salivary , adj لیکی ، گلیزی
- gland لقکا گلیزی . لقکا خویزی
salivate , v . t . i ( گه له ک ) گلیز دکت ، گلیز دئیت خاریٰ . گلیز ده ر دکت
salivated , adj گلیزکری
salivating , n گلیزکرن
salk , n ....vaccine یه کهم قوتان دژی شه‌هتی یا زاروکان
sallet , n خوده ییٰ سفک
sallow , adj , n , vt , i پیتی ، پیتی دبت . پیتی دکت
sallow , n سه لپ
sallowish , adj پیتی یی
sallowness , n پیتیتی
sallowy , adj سه لپی

sally , n , v . i ئیریش ( هیزیٰن ئابلوقه کرین ) چالاکی یا نشکی . په قین . ترانه . ریٰویتی ، ئیریش دکت . سه یران دکت ، ریٰویتی دکت
sally , n لفینا یه که ما زه نگیٰ بو لیدانیٰ
salmagundin تیکلی یا گه‌له‌مپه‌ر . ئامانیٰ گوشتیٰ ماسی ، هیک ئو پیقاز
salmi , n ئیخنی
salmon , n ماسی خاتونک ( سامون )
- berry ته خلیت فریز
- ladder, leap, pass ,stair زنجیره یا پینگافان داکو ماسی ژ سکری ببورت ئو ب سه ر رۆباری بکه فت
- pink ره نگیٰ قه ره نفه لی به‌رزه ریٰفه
salomonic , adj سلیمانی (ژ سلیمانیٰ په ندیار )
salmonoid , adj سامونی ، ماسی خاتونکی
saloon , n به رمال . سف . سه لک ، ئه یوان
- bar مه یخانه
- keeper مه یخانه فان
- pistol ده بانجه یا مه ودا کورت
- rifle تفه نگا مه ودا کورت
salpiglossis , n زمان زرنا . هه له زه ک گول کولک مه زن
salpingian , adj پیوه ندیداریٰ بوری یا ئوستاکی
salpingitis , n کولبونا بوری یا ئوستاکی ( بوری یا گوهـ لینونیٰ ئانکو بهیستنیٰ )
salpinx بوری یا ئوستاکی
salse , n برکانا ته قنیٰ
salsify , n شنگ . گیز به لوک
sal soda , n کاربوناتیٰن سودا
salt , n , vt خویٰ ، خویٰ دکت
- not worth one's .... پوچ
- of the earth خویٰ یا ئه ردیٰ . قه نجه مروف
- to eat a person's ...... میٰهـ فان دبت
- with a grain of .... پچه ک گوما نداری
saltant , adj سه مادار . بازدار

saltation , n بازدان . ليتك . سه ما ، گوهورينا نشكى . گوهارتنا زنده وه رى

saltatorial , adj سه مادار . بازدار

saltatory , adj سه مادار، بازدار

saltcellar , n خويدان

salted , adj خويكرى

salter , n خوئ فروش . خوئ چيكه ر

saltern , n كارگه يا خوئ

saltigrade , n پيرهه فوكا بازده ر

saltily , adv ب خوئ

saltiness , n خوئ يى تى

salting , n خويكرن

saltish , adj پچه كئ سير

saltless , adj بئ سى

saltmarsh , n زونگا شور ئاف

saltpeter , n كه فر خوئ

salt shaker , n خوئ هه ژينك

saltus , n گوهارتنا نشكى

saltwater , adj شوراو . شوراف

saltworks , n خويگه

saltwort , n هه له‌زا كاربوناتين سودا ژئ دئين ده ر

salty , adj سير . سور . شور

- land شوره ك . شوراخ

salubrious , adj ساخدار

salubriously , adv ب ساخدارى

salubriousness , n ساخداريتى

salubrity , n ساخداريتى

saluki , n تاژى ( عه ره بى : سلوقى )

salutarian , adj ساخله م

salutary , adj هاڤدار . ساخدار

salutation , n سلاف . درود

salutational , adj سلافى

salutatori... , n ( دهمئ ده‌رچونا پوله‌كئ ) خوه نده كارئ گوتارا خيرهاتنئ دبيژيت

salu... , n . v . t . i سلاف ، سلاف دكت

- ...ke the...... سلافئ وه ردگرت

...luting , n سلافكرن

salvable , adj رزگاريار

salvage , n . v . t رزگاركرن. رزگارى .هاوار، سامانئ رزگاركرى . رزگاركرنا گه مى يئ ئو بارى ژ نوقيبونئ . به ر ديلا رزگار كرنئ ، رزگار دكت

salvager , n رزگار

salvarsan , n ده رمانئ فره نگى

salvation , n هاوار.رزگاركرن.ئازادكرن . ئازاكرن

- army له شكه رئ رزگارى يئ ( ئوله ك ئايينى ( ل بريتانيا ) نيف له شكه رى يه .

salvationism , n رزگاريتى

salvationist , n رزگاركه ر

salve , n , v . t مه لحه م ، مه لحه م دكت . هه دار دكت . رزگار دكت ( گه مى يئ ، بارى ژ نو قيبونئ )

salved , adj مه لحه مكرى

salver , n سينى ( بو پيشكيشكرنا خوارنئ يان فه خوارنئ )

salvia , n هه له زه ك گول شين يان سور

salving , n مه لحه مكرن

salvo , n هاڤيتن(توپ يان بومبا ب ده ربه كئ) ، سلاف . په قينا نشكى ، باهوز

salvolatile , n كاربوناتين نشادر ( ئاڤه كى يه ك بيهنداره بو دل بورينئ ب كار دهيت)

salvor , n رزگار ( مروف يان كه شتى)

samaria چه نگارى . ميوه ياچه نگدار يه ك به‌رك ياكو فه نابت ، تيڤل وه ك چه نگى يه (وه ك ئردار يان ره شدارى )

samaritan , n , adj خيركه ر

samarium , n ساماريوم . هيمانه ك ميزتالى فه تلازه

samarskite سامرسكايت:ميزتالئ ئاسن، كالسيوم يورا نيوم ، زرنيخ ئو توريوم

samba , n سامبا : سه مايه

sambar , n په زكوفى يه ك مه زنه

sambo زارويئ دو توخم ، ( مه له ز )

sambur , n په زكوفى يئ مه زنئ هندى

same,adj, pron , adv هه مان ، خوه ، ب خوه

- all the ....... ل گه ل هندئ

- it is all the ...to me هه ر يه كه بو من

- just the ..... ل گه ل هندێ ، ب هه مان ئاوایی
- one and the ....... هه مان تشت
- the very ...... هه مان تشت
samel , adj ( كه لپوچ ) تیژ نه په حتی
sameness هه فیه كی
samite , n ته فنێ ئاقر میشی ل گه ل تایێ زێر ئو زیفی
samlet , n ماسی یا سامونا بچوك
Samoan , adj , n زمان یان وه لاتی یێ ساموا
samovar , n سه ماوه ر
samoyed , n , adj وه لاتی یێ مله تێ سایبیری مه غولی
samp , n ساڤارێ گه نمێ شامێ
sampan , n به له مه ک بچوك(ل روژهه لاتا ئاسیا )
samphire , n هه له زا كه ندالان ( به لگ ستور ئو شور بو ترشی یێ )
sample , n , v . t . سوسته . نمونه . راسته ک ، ئه زمون دكت ، نمونه یه كێ دبت . بژاره دكت
- room نیشانگه ها نمونه یان
-post پوسته یه ک ئه رزان
sampled , adj نمونه كری
sampler , n ئه زمونكه ریان كوكه رێ نمونه یان . بژاره ، پارچه یه ک ژ كاری ، ده رزی یا ئالالا ده ر ئینانا نمونه یان
sampling , n نمونه كرن ، نمونه
samson , n شه مشونێ ئه ژده ها
samsonian , adj پیوه ندیدارێ شه مشونێ ئه ژده ها
sanative , adj ساخكه ر
sanatorium , n ساخگه . بوژانگه
sanbenito , n كراسێ زه رێ ژوڤانێ
sanctified , adj پاک . بێ گونه هـ ، روباز . پیروزكری
sanctification , n پاكبون
sanctifier , n پیروزكه ر
sanctify , v . t . پیروز دكت ، پاک دكت . ره وا دكت ، به هانه دكت
sanctimonious , adj روباز
sanctimoniously,adv ب روبازی
sanctimoniousness,n روبازیتی
sanctimony , n روبازی
sanction , n , v . t پیشگیری ،سزا، فه رمان،یاسا راستاندن . ئه هیل ، راستاندن دكت ، رێ ددت
sanctionless , adj بێ راستاندن ، بێ ره واكرن
sanctity , n ریز . پیروزی
sanctuary , n نیشتگه . په ناگه . قه ف ، مه زار
- take .... دچت په ناگه یێ
sanctum , n درا پیروز
- sanctorum پیروزێ پیروزان
sanctus , n سرودا ئایینی ( پیروز ، پیروز ، پیروز ، مه زیقه یا ڤێ سرودێ )
sand , n , v . t سیلک ، خیز . زیخ . رتام،خیز دكت .ب خیزی دنخیڤت یان تژی دكت، ب خیزی یان كاغه زاخیزی پاقژ دكت
- bag ته لیسێ خیزی
- bank گرێ خیزی
- bath گه رمكا خیزی
- blast ره وته كا خیزی ( بو پاقژكرنێ )
- box خیزدان
- grouse كوركوری . قتک
- hill زیر یان گركێ خیز
- paper سمارته . كاغه ز جمباد ، كاغه زا خیزی
- piper چیچكا تیته لانی
- stone كه ڤر یان به ر خیز
- the...s are running out ده م ل به ره ته مام ببت
sandal , n سول ته خلیت داره . پیلاف ، شمک چه رخ . شه كال
- tree دار سه نده ل
- wood سه نده ل . ( دار )
- wood oil رونێ دارێ ( سه نده ل )
sandarac , n ته خلیت شریز
sandarac tree . n دارێ شریزێ
sandbar , n گركێ خیز نیكو رادان یان ره وته كا ئاڤێ چیدكت
sand blind , n نیف كوره
sandboy , n كوركێ خیزی ،یتنكا وه ک كنچێ یه
sand - cast , vt دادریژت ناڤ خیزیدا
sand casting , n دارشتنا ناڤ خیزیدا
sander , n خیزكه ر
sanderling , n بالنده یه ک وه ک چیچكا تیته لانی
sanders , n دارێ سه نده ل
sandglass , n= hour glass

sandiness , n خیزیتی

sanding machine , n مەکینە یا خیزکرنێ بۆ هورکرن ئو حلیکرنێ

sandiver , n گلیشا ئاڤە کی یاشوشە یی

sand launce or eel , n مارماسی یا خیزی

sandlot , n یاریگە ها خیزی ( بۆ زاروکان )

sandman , n خیز ڤان . کو ئە فسانە دبێژت زار وکان دبیڤت ب پزروکێن خیزا دهاڤیت سە ر چاڤان

sand table , n مێزا خیزی ( بۆ زاروکان یان مە شقێ )

sandwitch , n هورچ . کادک ، نانێ دو تا . توتک . کادە ، ساندو یچ

- man مێرکێ ساندویچ یێکو دو ئاگە هداری یان هە لدگرت : یە ک ل بە ر سینگی ئو یە ک ل سە ر پشتێ

sandwort , n گول خیز

sandy , adj خیزی

sane , adj هشیار . ژیر ، عاقل

sangfroid , n هە داری ، خوراگری . نە ترە

sanguification , n خوین چیکرن ( ژ خوراکێ )

sanguinaria , n خوینە لو ( هە لە ز )

sanguinarily , adv ب خوینریژی

sanguinariness , n خوینریژیتی

sanguinary , adj خوینریژ . دە ڤ خوین . خوینی . خوین خواز

sanguine, adj , n .v.i سورێ تاری . خوینی . خوینریژ . روژگە شی .گە شبین . خوشبین ، دە ڤ خوین.ماد خوینی.خامە یێ خوینی: خامە یێ سورێ نە قشکرنێ ، ب خوین دکت

sanguineous , adj سور تاری.خوینریژ ، خوینی . تیر خوین ، دە ڤ خوین ، گە شبین . پشت راست

sanguinity , n خوینیتی

sanguinolent , adj خوینی . خوین تیدایە یان خوینکری یە

sanicle , n هە لە زە ک ئیشیدار بە ریێ دە ر مانی بو

sanies ئاڤە کی یا روهنا خوینی یا قونێر دە ردکت

sanify , vt ساخلە م دکت

sanitarian , n , adj ساخداری ، ساخلە می ، دروستانە یی . دروستانە

sanitarily , adv ب دروستانە یی

sanitariness , n دروستانە یی تی ، ساخلە میتی ساخداریتی

sanititarium,n=sanatorium

sanitary , adj دروستانە

- napkin دە رسوکا دروستانە

sanitate , vt دروستانە دکت ،ب ئاوایێن دروستانە دکت

sanitated , adj دروستانە کری

sanitating , n دروستانە کرن

sanitation , n در وستانە کرن

sanitizaion , n پاقژکرن ، دروستانە کرن

sanitize , vt دروستانە دک ت(ب پاقژکرنێ )

sanitized , adj پاقژکری . دروستانە کری

sanitizing , n پاقژکرن ، دروستانە کرن

sanity , n هە ست . هش

sank , (p . of sink ) نوقیکر . نوقی بو .

sannyasi , n پارسێکێ ئولی یێ هندی

sans , prep بێ

Sanskrit , n , adj سانسکریتی . زمانێ کە ڤنێ پیروزێ هندستانێ

sanskritic , adj سانسکریتی

sanskritism , n سانسکریتیتی

santa claus , n سانتا کلوز

santir , n سە نتور

santolina , n تە راشە ک بێهن خوە ش

santonica , n تە خلیت کرمێ داری

santonin , n سانتونین : پێکهاتی یە ک ژە هری بە لوری

santour , n سە نتور ( ئالاڤا مە زیقە یی )

sap , n , v . t ئاڤ یان شیرێ داری . چە پە ر ئاوگ ، لاواز کرن ( باوە ری ، زە بری ، ئازایی ) ،( داری ) هشک دکت . چە پە ری چێدکت، لاواز دکت

sapajou , n مە یمونکا بچۆکا باشورا ئە مریکا

sapanwood , n دارێ هە شا سور

sapele , n داره ک قایم
saphead , n سه رێ به راهی یا چه په ری . گه وج
sapheaded , adj گه وج . خریو
sapid , adj تام خوه ش . بێهن خوه ش
sapidity , n بێهن یان تام خوه شی
sapience , n په ند . په ندیاری
sapiency , n په ندیاری
sapient , adj په ندیار
sapiently , adv ب په ندیاری
sapless , adj هشک . دل سست ، لاواز
sapling , n ساڤا ، شتل . ده رک . ده رخک .
ده ڤی‌نه مام .ته راش . لاوک . بسپور
sapodilla گوهیژا ئه مریکانی
saponaceous , adj سابونی
saponated , adj سابونکری
saponifiable , adj سابونبار
saponification , n سابونکرن
saponifier , n ئالاڤا سابونکه ر
saponify , v . t . i سابون دکت ، سابون دبت
saponin , n سابونین
saponite , n سابونایت
sapor , n . تام ، بێهن
sapper , n ئه ندازیارێ له شکه ری
sapphic , adj , n هوزانی یا چار ریز
sapphisim , n هوزانی تی یا چار ریز
sapphire , n , adj سافیر :یاقوتێ شین ، شینێ ئه کری
- wedding , n بورینا ٤٥ سالان ل سه ر شوکرنێرا
sapphirine , adj , n سافیری
sapphism , n ژنبازی یا ژنان
sappiness , n ته ری ، تیر ئاڤی (هه له ز) ، ته ریتی
sappy , adj ئاوس . ئاڤس . گه وج چالاک . ته ر
sapr (o) پێشگره کو رزی یه
sapremia تایا گه نی . ته خلیت ژه هریونا
خوینێ
saprogenic , adj گه نی
saprolite , n ساپرولایت . که ڤرێ که ڤنێ رزی

saprophagous , adj گه نی خوه ر
saprophyte , n رزی خوه ر
saprophytic , adj پێوه ندیدارێ رزی خوه ری
saprozoic,adj=saprophytic
sapsucker , n ئاڤ مژه ک ، وه ک دار کوتوکی
sapwood , n دارێ ئاڤی ( ئاڤبه را تیڤل ئو ئاڤکا
هشک )
saraband گوڤه ندا که ڤنا ئیسپانی
saracen , n , adj کوچه رێ سه حرایێ ، عه ره ب .
بوسلمانێ ده مێ شه رێن خاچ
په رستان
saracenic , adj عه ره بی . بو سلمانی
sarc (o) پێشگره کو گوشته
sarcasm , n په رتاڤ . ترانه . حه نه ک ،
قه شمه ری.ته ڤز . تیز .گالته . تناز
sarcastic , adj ته ڤز که ر
sarcelle , n ته خلیت قازه ک بچوکه
sarcenet , n سارسه نیت : ته ڤنێ ته نکێ ئاڤرمیش
sarcocarp , n ئاڤک یان کاکلا میوه یی
sarcode , n . پروتوپلازما جانه وه ری
sarcology , n ئه شته رکاری یا پارچه‌یێن
گوشتدارێن له شی
sarcoma , n په رچفتنا ته ڤنێ پێگرێ سه ره تایی
sarcoplasm مادەیێ ئاڤ ریشالی یێ ماسولکه یی
sarcophagic , adj =
carniv orous
sarcophagous , adj =
carniv orous
sarcophagus , n دار به ستا به ری
sarcoplasm , n ماده یه ک ده ماری یێ ماسولکه یی
sarcous , adj گوشتی . ماسولکی . زه بله کی
sard , n سارد : به رێ هێژا یێ سورێ
سه ر زه ر بێه
sardanapalian , adj پێوه ندیدارێ سارداناپالوس شاهێ
ئوماهی یێ ئه فسانه یی یێ نینه وا

sardelle , adj وه ک ماسی

sardine , n ته خلیت ماسی یا هور ، هوره

- fish ماسی هورک

Sardinian , adj وه لاتی یان زمانێ گراڤێ ساردینیا

sardius , n به ره ک هێژا

sardonic , adj زمان تال . ترانه که ر . ته ڤزکه ر

sardonyx , n ئونیکس . به رێ هێژا

sargasso , n که ڤزا ده ریایی

sargeant , n ناسکه ر . سه ر ده هان . چاویش

sari , n کراسێ ژنێن هندستانێ . که وا

sark , n کومله ک ، ده پێ ناڤبه را ستونی ئو
کاشخانکا

sarking , n کومله ک

sarmentose , adj چق ، زراڤ

sarong , n جلێن مالیزی یێن نه ته وه یی ،
په روکێ ڤان جلان

saros , n ده مێ ١٨ سالان ناڤبه را دوباره بونا
روژگرتنێ

sarsen , n حه لانێن به رخێز

sarsenet , n ئاڤرمیشێ نه رم ئو ته نک

sartorial , adj دریاری

sartorius , n به ڤا رانی

sash , n که مه ر به ند . ده رسوک . که نارێن
په نجه رکێ

- cord به نکێ که ناری

- line به نکێ قایمێ که ناری

- pocket ڤالاتی یا ل هه ر دو ره خێن که نارێ
په نجه رکێ

- pulley دارتونا به نکێ که ناری

- tool ته خلیت فرچه یا شوشه ڤانی یان
که ڤالڤانی

- weight سه نگا که ناری

- window په نجه رکا که نارکری

sashay , n , vi رێویتی . رێباری ، دته حست . دچت
. پێنگاڤێن بونگی دها ڤێت

sashed , adj که نارکری

sashless , adj بێ که نار

sasin , n په زکوڤی ( نیپالی - هندستانی )

sasine , n خودانێ سامانێ ده ره به گی

sass , n , vt به رسڤا ره ق ، ره ق دئاخڤت

sassaby , n په زکوڤی یه ک مه زن ( باشورا
ئه فریقا )

sassafras داره ک بچوک

sassanian , adj مالباتا شاهێن فارسی

sassanid , adj مالباتا شاهێن فارسی

sassenach , n مروڤ یان تشتێ ئنگلیزی نمونه یی

sasswood , n دار ساس : دارێ ئه فریقایی تیڤل
ژه هره

sassy , adj = saucy

sassy bark , n تیڤلێ دار ساس

sat , (p of sit) دانیشت . رونشت

satan , n شه یتان ، ئه هریمه ن

satanic , adj شه یتانی

satanically , adv ب شه یتانی ، شه یتانه کی

satanism , n شه یتانیتی ، شه یتان په رستن ،
به د خوازی

satanist , n به دخواز

satanology , n شه یتانزانی

satchel , n پارزین . توربه چه نته یێ دبستانێ

satchelled , adj چه نته دار

sate , v . t تێر دکت

sated , adj تێر.تێرایی .تێری . تێروپڕ ، تێرکری

sateen , n په روکێ په مبو یان هری یێ
ته یسی

satellite , n , adj ستێرکوک . دیڤه لانک

satellitic , adj دیڤه لانکی

satiable , adj تێربار

satiate , adj , vt تێرکری ، تێر دکت

satiated , adj تێرکری

satiating , n تێرکرن

satiation , n تێربون

satiety , n زۆرخوری . تێربون

satin , n , adj ساتانی ، حلی ، پە رۆکێ ئاڤرمیش .
ساتان

- beauty مە حفور

- cloth پە رۆکێ هری وە ک ساتانی ڤە هینایی

- finish حلیکرنا زیڤی ب فرچە یا مێزتالی

- gypsum گێچا ریشالی یا وە ک مراری

- paper کاغە زا تە یسی یا نڤیسینێ

- stone=satin gypsum

- wood دارێ دە پێ نایاب

satinet , n ساتانێ نە نایابێ پە مبوکری

sating , n تێرکرن

satiny , adj ساتانی

satire , n ڤرهاویشتن . داشوری . لێپوک

satiric(al) , adj تە ڤزکە ر . نترک

- poem or poetry ڤرها ویشتن

satirically , adv ب تە ڤز کە ری

satirist , n ترانە کار . پە سقە ل . پە سخە ل ،
تە ڤزکە ر

satirize , v . t ترانە یی ئێریش دکت

satisfaction , n دلخوە شی . تێربون . هە دار . دابین
قایلی .دلنیایی .دلنیاکرن رازیبون .
هە دان .قنیات.قیم . قیمبون . رازیتی

satisfactorily , adv ب دلنیایی

satisfactory , adj ئاسودە ، دلنیا

satisfiable , adj قایلبار

satisfied , adj تێر . رونا ندی . تێرکری .دلخوە ش .
پشت راست ، چاڤ تێر ، دل هێسان .
قایل.دلنیا .هە دار ، پێخوە ش ، رازی

satisfy , v . t ,i دلنیا دکت . دهە درت ، قایل دکت .
دهە درێنت

satisfying , adj دلنیا دار . قایلدار ، قایلی ، رونا ندار
، ئاسودە دار

satrap , n سە رکارێ دە ڤە رێ ، فە رمانرە وا ،
. دە رە بە گ

satrapy , n فە رمانرە وایی . دە رە بە گی

satsuma , n کالوتێ زە رێ پێتی یێ ژاپونی

saturable , adj تێربار

saturant , n تێرکە ر

saturate , vt , adj تێر ، تێر دکت

saturated , adj تێر ، تێرکری .

- compound ئاوێتە ی تێر

- solution گیراوە ی تێر

saturation , n نە ماندن .تێرکرن ، دابینی ، تێربون

- current لوزە وی تێربون

- point خالکا تێربون

Saturday , n شە مبی ، شە مبە

saturn , n ساتورن : خودایێ چاندنێ ل نک
رومانان ، کە یوان . ئاستان

saturnalia , n شایی یا کە یوانی

saturnian , adj , n ساتورنی ، کە یوانی

- age رۆژگارێ زێرین

- metre پیڤانا هوزانا رومانی

- verse پیڤانا هە لبە ستا رومانی

saturnic , adj ساتورنی . کە یوانی

saturnine , adj ماد مروس . گرێچی ، ترانە یی .
مروس . مریتو

saturninely , adv ب مروسی

saturnism , n ژە هربونا گرێچی

saturnus , n ئاستان ( ستێر )

satyagraha بە رگری یا نە رێ یی یان نە دژوار

satyr , n مروڤێ بە لقتی . خودایێ دارستانێ
شکل مروڤ ، ل نک گریکان ، گوهـ
ئو دوڤکێ هە سپی

satyriasis , n بە لقتین ، ڤیانا رە گە زی یا بێقاما
مێری ( نێری )

satyric , adj ترانە یی ، تە ڤزی

satyrid , n پە لپە لیتک

sauce , n , v . t زە رزە واتێ ل گە ل گوشتی ،
میوە یێ لێنایی .رۆقایمی ئێخنی.
مە تفینی.تامدار دکت، رۆقایمی دئاخڤت

- box مروڤێ رۆقایم

- pan ئاغلە ویک

- to mato... ئێخنی یا باجان سور کان

- white ....... ئێخنی یا نیڤشک ئو ئاری

sauceless , adj بێ ئێخنی

saucer , n سێنیک یان کاسکا فنجانێ

- eye چاڤێ مە زنێ گروڤر

saucerful , adj ته ژی کاسکێ
saucerless , adj بێ کاسک
saucily , adv ب رۆقایمی
sauciness , n بێ ئاری ، رۆقایمیتی
saucy , adj رۆقایم . لاو . زمان تال
Saudi , n , adj وه لاتی یێ عه ره بستانا سعودی
sauger , n ماسی‌یه‌ک رۆباری ئه‌مریکانی ، دارێ لیسی ؟
sauna , n گه رماڤ یان سه رشوکا هلمی
saunter , n , v . i گه ران ، دگه رت
saunterer , n با گوهێز ( سه یرانی )
sauntering , n سه یران . گه ران ، باگوهورین
saurel ته خلیت ماسی یه
saurian , adj , n توخمێ کمکه یی تیمساح ژی ل گه ل!
sauropod , n سوروپود : ته خلیت دیناسوره
saury , n ته خلیت ماسی یه
sausage , n سوسه ج . روڤیکا داگرتی ( ب گوشتێ قیمه کری ئو به هاراتان )
- filler grinder machine که ره سته‌یێن چێکرنا سو سه‌جێ
- meat گوشتێ سوسه جێ . قیمه
- roll گوشتێ سوسه جێ دناڤ هه ڤیریدا بۆ په حتنێ
saute , adj , n , vt خوارنا ب له‌ز دقه‌لت ( دناڤ ئاغله ویکێدا ) ، خوارنێ زو دقه‌لینت
sauter , n شه رابه ک سپی یه
savable , adj رزگار بار
savage,adj , n , v . t. دل هوڤ ، دڕ . هوڤ ، هوڤه به ر درنده .گورێخ دڕ ئو دژوار ئێریش دکت
savagedom , n درنده یی تی ، هوڤی تی(هو ڤستان )
savagely , adv ب هوڤی . ب درنده یی
savageness , n دڕیتی . هوڤی تی ، درنده یی تی
savagely , adv ب درنده یی ، ب هوڤی . ب دژواری
savagery , n گوریخ .گورێخ .هوڤی تی ، هوڤه به ری
savanna(h) , n ده شتا بێ دار
savant , n زانا . زانیار
savate , n ته خلیت کولبازی ( ده ست ئو پێ ب کار دئێن )
save , n , vt رزگاری . قورتال ، دهلینت . رزگار دکت .
- all وه ردت
save , prep , conj تینه . نه تێ
save - all , n پارێزدار
saved , adj وه ردایی ، هلخستی . ڤه ره ستی رزگار کری
saveloy ته خلیت سوسه ج
saver , n رزگار
savin (e) , n هه ڤره ستێ مه زن
saving , n رزگارکرن . دانالی.هاوار ، هلخستن . پاشداخستن . وه ردان . رزگاری ، هلینان .
savings , n وه ردان ، پاشه که وت . پاشرۆژی . پاشرۆژ ، نوته کردن
- bank درا ڤگه ها وه ردانێ
saviour , n رزگار کار . رزگار که ر . رزگار
savory , n گیایه ک وه ک پونگی‌یه بۆ لێنانێ ب کار دئێت
savour , n , vi , t تامدار ، بێهن خوه ش تام ، چه ژ . چه ش ، تامدار دکت ، پێشنیاز دکت ، پێشنیازێ پێشکێش دکت
savourily , adv ب تامداری
savouriness , n تامداریتی
دلچونی
savo(u)ry , n تامدار
savoy , n ته خلیت که له مه . له هه ن
savvy , adj ژیری
saw , n , v . t . i خیزار . شه ڤه . هه ره . بره ک . مشار ، دبرت ( ب خیزاری )
- bill مه راڤی
- doctor مه کینه یا چێکرنا ددانێن خیزاری
- dust ته لاشی . ته لیش . که په ک ، پینه
- frame ده ستکێ کێرا خیزاری
- gate ده ستکێ کێرا خیزاری
- wort هه له زێ هه شه ک زه ر ددت ( ژ به لگێن ددانکری )
saw , n په ندا پێشی یان
saw , (p of see) بینی . دیت ، نهێری
saw buck , n = sawhorse کاغه زا ده هـ دولار
sawed , adj خیزار کری
sawder , n ئاخفتنا په سن

sawfish , n ته خلیت ماسی ( خیزارک )
sawfly , n میشا خیزاری
saw grass , n گیایێ خیزاری : به لگ ددانکری وه ک خیزاری
sawhorse , n هه سپێ خیزاری . کو داری ل سه ر دانێ بۆ خیزارکرنێ
sawing , n له دیران
sawlog , n قورمێ دارێ کێرتێت بۆ خیزارکرنێ بۆ ده پان
sawmill , n خیزار گه . تاشێ خیزارکرنێ
sawney , n , adj گه وج
sawtooth , adj ددان خیزار
sawyer , n خیزار که ر : کێزا دارێ کون دکت دارێ رهـ ل بن ئاڤێ ئو چق و به لگ ل سه ر ئاڤێ
sax , n ( zax) بڤر
sax , n = saxophone
saxatile , adj زینده وه ر ( بناف که ڤراندا )
saxe , n ته خلیت کاغه زا وێنه گرتنێ
saxhorn , n بوریزان
saxicoline - lous =saxatile
saxifrage به ر شکێن ( گول )
saxon , n , adj مروڤ ، وه لاتی یان زمانێ گه له ک ئه لمانی ییکو پارچه یه ک ژ ئنگلیز- ستانێ داگیر کری ( سه دا ه – ٦ ) ، وه لاتی یێ ساکسونی
saxony , n هری یا هور یا نه رم ، په روکێ ڤێ هری یێ
saxophone , n ساکسوفون : ئالاڤه ک مه زیقه یی
saxtuba , n , v . t . i بوریزانه ک مه زنه
say , n , adv , vt , i گوتن ، دبێژت . ده ی دکت
- that is to ...... ئانکو
- to ........of نه له ، ژ بلی
saying , n گوتار . ده یکرن . گوتن
say - so , n گوتن
scab , n , v . i گر . که لپک . شه لقی . قالکێ شوری . گوری دگرت
scabbard , n کالانێ خه نجه رێ، کیف .قاب ،کالان

- fish ماسی یه ک ده ریایی سپی زیڤی وه ک کالانێ شوری
scabble , vt که ڤری زڤر دتراشت
scabby , adj گر ، گوری
- headed که چه ل
scabies , n گوری
scabietic , adj گوری یی
scabiosa گول گوری
scabious , adj , n گوری . گر
scabrous , adj ئالوز ، زه حمه ت . سه خت ، زڤر . به رده یایی ، پچه کێ شه رم
scad , n ته خلیت ماسی یه ، تبابه ک مه زن
scaffold , n . v . t سێداره . قناره . قه ناره ، شانو . هه رزال . سکه لله ، پهیکه ر ، سکه لله دکت ، پهیکه ردکت
scaffolding , n پهیکه ر . سکه لله ، که ره سته یێن سکه لله یێ
scagliola , n زر مه رمه ر
scalable , adj سه رکه تنبار ، هلپرژیار
scalage , n پیڤان : نزمکرنا کێمی یێ ( ب رێژه یه ک سه دی بۆ په رتالێن قورمساندی ل گوهازتنێ )
scalar , adj پێلکی ، ژماری
- product لێکدانێ ژماری
- quantity تبابا نه ئاراسته کری
scalare ته خلیت ماسی
scalariform , adj پێلکی
scalawag , n کێرنه هاتی . بێژی
scald , n , v . t سوتنا له شی ( ب ئاڤا گه رم ) سوتن ئو ره شبونا ته نێ هه له زی ژ به ر گه رمێ ئو تاڤێ ، گه رم دکت . دسوژت ، پاقژ دکت (ب ئاڤا گه رم ئو هلمێ )
- head نه ساخی یا پیستێ سه ری
scalding , adj سوتندار
- tears روندکێن کوڤانێن به هێ یان
scale , n . v . t ته رازو،پێوه ر. پیڤه رته رازی . شه هین، که لپک، دکێشت، دپه رکت

| | |
|---|---|
| -to throw into .... | دکت ناف کێشه بێدار |
| -to tip or turn the .....s | دبت ئه گه رێ سه ر که تنێ |
| - for checking | شاقول |
| - to hold the ...s even | ته رازوییێ راست دکێشت ، داوه ری دکت |
| - to remove the...from her eyes | په رده یێ ژ سه ر چاڤان رادکت داکو راست پرسێ ببینیت |
| - to turn the ....... | پرسێ ڤه دبرت |
| - to ....down | کێم دکت ( به هایی ) |
| - to .....up | به رز ( پتر ) دکت |
| scale armour , n | مه تالێ زرێکری |
| scale board , n | ده پێ ته نکێ پشت خودیکێ |
| scale - down , n | نزمکرن . کێمکرن |
| scale insect | سپه ها هه له زێ |
| scale moss | هه له زا به لگ که لیکی |
| scalene , adj , n | لا نه یه کسان یان نه ته ریب |
| - triangle | سێ گوشه ی جیالا |
| scalepan , n | سێنی یا ته رازوییێ ، تایێ ته رازو |
| scaler , n | هلپرژ . بژمێر . ژمێرک |
| scales , n | ته رتیش |
| - of a fish | پاره یێن ماسی یێ |
| scale tail , n | دوڤ ته رتیش |
| scale - up , n | هلپرژ ، په رکێن . لێلکرن |
| scaling , n | زێده کرنا کرێ یان موچه یی ( ب رێژه یه کێ ) |
| - ladder , n | پێسترکا ڤێ زێده کرنێ |
| scall , n | که لیکێ سه ری |
| scallion , n | ڤوراد . پیڤاز ته رک |
| scallop , n , v . t | شه یتانوکێ باوه شێن ، پارچه یه ک گوشت ته نک ، شه یتا نوکێ وه ک باوه شێنی ، کوم دکت ، کارتول یان ماسی یێ ب ئێخنی دپێژت |
| scallywag , n | جانه وه رێ هور یان ڤه لس ، مروڤێ پوچ |
| scalp , n , vt | نیشانا سه رکه تنێ ، پیستی سه ر . پیستێ سه ری ، پیستێ سه ری . که ڤل دکت ، دکرت ئو دفروشت داکو ژو هاڤل بکت ، پسوله یێن شانویی ئو وه رزشی دکرت ئو دفروشت |
| - out for ..... | ئه وله ھی یه کو دوژمنی بشکێنت |
| scalpel , n | نه شته ر |
| scalp lock , n | گولی یا ڤه بکرنێ یان به رهه نگاری یێ |
| scalper , n | که ڤلکه رێ پیستێ سه ری (ددان تیژ ) |
| scalpiform , adj | چیق |
| scaly , adj | ڤه رتیشی |
| - finned | شاپه ر ڤه رتیشی |
| scammony , n | سکامونی : له بلابا ژ رهان شرێزا زکچونێ دئینن ده ر ، رها سکامونی . شرێزا سکامونی |
| scamp , n , v . t . | بیژی . کور یان که چا فێلکار ، ب له ز ئو به ز کار دکت |
| scamper , n . vi | به زین . ره ڤین ، دره ڤت ، دبه زت |
| scampered , adj | به زی |
| scampering , n | به زین |
| scampi , n | ئامانێ رۆبیانێ مه زن |
| scan , n . v . t .i | سه حکرنا هور ، برینا هوزانی ، ڤه نج سه ح دکت . دبیڤت ، ل ئارمانجێ دگه رت ( ب رادارێ ) |
| scandal , n | ڤه بحه ت ، ئابروبه ره ، ئابروچون رسوا . رسوابون |
| - monger | ڤومسی |
| - sheet | روژنامه یا ڤه بحه تان |
| scandalize , vt | بێ ئابرودکت |
| scandalized , adj | بێ ئابروکری |
| scandalizing , n | بێ ئابروکرن |
| scandalous , adj | روزه شی . ئابروبه ر ، رسوایی |
| scandalously , adv | ب رسوایی |
| scandalousness , n | رسواییتی |
| scandent , adj | باداک |
| - vine | سه خمه . سوخمه . سخمه |
| scandium , n | سکاندیوم.هیمانه ک میزتالی سپی یه |
| Scandinavian , a , n | وه لاتی ئو زمانێ سکه ندیناڤیا ( دانمارک ، نه رویج ، سوید ئو ئیسله نده ) |
| scannable , adj | سه حکرنبار |
| scanned , adj | سه حکری |
| scanner , n | سه حکه ر |

- heart ....... دلبین
scanning , n سه حکرن
scansion , n برین : پارچه کرنا پیڤانی یا هوزانێ
scansorial , adj سه رکه تنی ، هلپرژینی
scant , adj , adv چکوس .ده ست مچ ره زیل.ده گمه ن کێم .لاواز ، ب زه حمه ت . ب کورته کی
scant , v . t کێم دکت ، نزم دکت ، ده ست دگرت
scantily , adv ب هندکی
scantiness , n هندکایی
scantling , n تبابه ک کێم ، پارچه یه ک بچوک ، پارچه یه ک دار . دوراتی بێن داری یان به ری بۆ ئاڤاکرنێ
scanty , adj که م . کێم . کێمه ک ، لاواز . نه به س
scape , n باسکوکی ، رهی . باسکێ بچوکێ بێ به لگ بیکو ژ رهێ ده ردکه ڤت ، ستونا کاریته یی : پارچه یێ سه ره کی ل ناڤبه را سه ر ئو بنیدا
- scape پاشگره کو دیمه نه
scapegoat , n بزن یان به رانێ قوربانی یێ
scapegoating , n به رپرسکرنا که سه ک دی
scapegrace , n بیژی . گاریسێ چاک نابت
scapement , n ره ڤین
scaphoid , adj , n هه ستی یێ وه ک به له مێ
scapose , adj باسکداری رهی
scapula , n که له کوچ . که لکه کول . شه پیلک
scapular , adj , n ملی . شه پیلک . شه پیلکی . کراسێ فره هێ بێ هچک ، نیشانا ملی . هه ستی یێ ملی ، په رێ ملی ( بالنده )
- feathers په رێن بن چه نگی
- region پاش مل
scapulary, n,adj=scapular
scar , n , v . t . i بزماته ، شه قتین . جێبرین . برین شونبرین . شوپا مایی ل سه ر باسکی پشتی که تنا به لگی ، شوپا زیانا سوزیاری ، برین دار دکت . بریندار دبت، وه سا ئازا ر ددت کو شون بمینت
scarab , n کێزا پیروزا ریخێ ل مسرا که ڤن
scarabaeid , n , adj کێز ( ب گشتی) . کێزی
scarabaeoid , adj وه ک کێزێ
scarabaeus = scarab
scaramouch (e) فورته ک

scarce , adj , adv کێم . ب زه حمه ت،ب کورته ک
scarcely , adv ' هه و ، نه نجه خ
scarcement , n پاشقه چونا دیواری . ده رزا ڤێ پاشقه چونێ
scarceness , n هند کایی . کێماتی
scarcity , n کێمایی .هندکایی .کێمی .ده گمه نی
scare , n , v . t ترس .هه ژڤین ، دترسینت
- crow کالو
- head ناڤنیشانا هه ستیارا رۆژنامه یێ
- monger ترسکار . بازرگانێ ترسێ
scared , adj هلچاندی . بزدهی . توقاندی . ترساندی ، هه ژڤی . هه ژڤاندی
- away ته ریلی . ته ریلاندی
scarer , n ترسینوک ، ترسکار
scarf , n , v . t ستوپێچ . ملپێچ دوماهی یان پێکڤه دگرت ( ده پ . مێزتال . یان چه رم )
- pin سنجه قا ستوپێچێ
- skin که لپکێ چه رمی
scarification , n روشاندن . شه قتاندن
scarify , v , t دشه قتینت بریندار دکت(دخرمشینت)
scaring , n هلچاندن . توقاندن . بزداندن ، ترساندن
- away ته ریلاندن
scarious , adj په رده یی هشک
scarlatina , n سوره تا . تایاسور
scarless , adj بێ برین .بێ خرمشین . بێ شه قتین
scarlet , n , adj سور . قورمز . ئال
- fever سوره تا . تایاسور
- letter تیپا قرمزی . تیپا (A). کو گونه هکارێن تره کی پێ داخ دکرن
- runner هه له زا لوبی یان
- woman دێهل
scarp , n , v . t به رێ چه په ری : نشیڤی یان دیوارێ چه په ری ، نشیڤی یا تیژ نشیڤ دبت ، ( شاقولی ) دبرت
scarred , adj شه قتی
scarry , adj شه قتی

scarus , n ماسی یه ک ره نگین ( لام وه ک نکلی )
scary , adj بزدهین . ترسینوک ، ترسناک
scat , n , v . t سترانا بێ واتا ، ده ردخت . زو دچت . سترانا بێ واتا دبێژت ، وێڤه هه ره !
scat (o) - پێشگره کو پیسه . گویه
scathe , n , v .t زیان . ئازار ، دئێشینت . ئازا ددت . دژوار ره خنه دکت
scathed , adj ئێشاندی
scathing , adj بێقام ره ق . گه زین . تیژ
scatology , n گوزانی
scatophagous , adj ریخ خوه ر . گوخوه ر
scatter , n وه شاندن . به لاڤکرن . وه شه ک
- good زه هێکه ر . ده ست به ردایی
scatter , v , t , i دوه رینت . دپه ژکینت . به لاڤ دکت دوه شینت
scatter brained , adj گه و ج
scattered , adj چرف . چرڤاندی . تارومار . پێوه رکری ، په رت . پژکاندی . هاوێر ، پژلاندی . ڤه پژکاندی . ڤه ره ڤیایی . وه راندی . به لاڤ
scattering , n په رشبون . چرف . به لاڤ . ڤه ره ڤین، گش . په رشکرن. به لاڤکرن. وه راندن. وه رهان، پژکاندن. پێوه رکرن. ڤه دان . په رتبون ، چرڤاندن
scattering of light, به لاڤبونا روناهی یێ
scatteringly , adv ب به لاڤبونی
scatter rug , n به رکا بچوک ( بۆ راخستنێ ل دره ک ڤالا ل ژۆر )
scattily , adv ب هش لاوازی
scattiness , n هش لاوازیتی
scatty , adj هش لاواز . خرپو
scaup , n ته خلیت وه رده ک
scauper=scalper
scavenge , vt , i غازا سوتی ده ردخت . میرتالێ بوهوژی بژین دکت ، نمالت . پاقژ دکت ، ل خوارنێ دگه رت
scavenger , n , vi پاکه ڤان ، پاکه وان ، زبلکێش ، غازێ ده ردخت ، ل خوارنێ دگه رت ( ل ناڤ گوفکاندا )

scavenging , n پاقژکرن
scazon , n پیڤانه ک هوزانا گریک یان رومانی
scenario , n ده قا سینه مایی . مه له زا شانوگه ری یان سینه مایی
scenarist , n سینار یو نفیس
scene , n چاڤ بینه ک . دیدار . دیمه ن
- behind the ...s نهینی . ل پشت په رده یان ل پشت په رده یا شانوێ
- painter که ڤالڤانێ دیمه نان
- shifter , shifting مروڤێ دیداری ل شانوێ دگوهورت
scenery , n که ره سته یا شانوێ دیمه ن ، دیدار
- change of ....... گوهورینا دیداری
sceneshifter , n گوهورا دیمه نان ( ل شانوێ )
scenic , adj شانویی . کرداری . دیمه نی . دیمه نێ سروشتی یێ جوان
scenically , adv ب دیداری
scenographer , n نه قشکه رێ دیمه نی
scenographic , adj نه قشکرنی یا دیمه نی
scenography , n نه قشکرنا دیمه نی
scent , n شیانا سه حکرنێ ، سه حکرنا بێهنێ . هشا هوندوری . به رامه بێهن . بێهن خوه ش . بێهن خوه شی ، بهنوک ، بێهن دکت . سه ح دکت ، بێهن ژێ دئێنت
- bottle شوشه یێ گولاڤێ
- gland لڤکا بێهنێ
- to throw off the .... دخاپینت ، شونێ به رزه دکت
scented , adj بێهن خوه ش . بێهنکری
scentless ,adj بێ بێهن
scepsis , n گومانا ژیرزانی
sceptic , n = skeptic
sceptical,adj=skeptic
scepticism , n گومانکاری
sceptre , n چوگان ٥
schappe , n په روک یان به نکێ ئاڤریشمێ پاشمایی
schedule , n , v . t مه له زه ، مه له زه دکت
- according to ...... وه ک مه له زکری
scheduled , adj مه له زکری
scheduled flight فرینا مه له زکری یا بالافرێ
scheduling , n مه له زه کرن
scheelite , n ته نگستیتا کالسیوما به لوری

schema , n مه لهه زه . هيلكارى
schematic , adj پيلانى . مه لهه زه يى
schematically , adv ب مه لهه زى
schematization , n مه لهه زكرن
schematize , vt مه لهه زه دكت
schematized , adj مه لهه زه كرى
schematizing , n مه لهه زه كرن
scheme , n , v . i . t پيشك . پيلان . مه لهه زه ، به رنامه پيلان دكت . مه لهه زه دكت
schemer , n پيشكار . پيلانگير
scheming , n بنقه كولان . دوبه رى ، عه وان
scherzando مه زيقه يا شادى
scherzo , n مه زيقه يا چالاك ، سفك ئو شاد
schism , n دوبه ره كى . ريباز گه . دوبه رى
schismatic , adj , n دوبه ره كى .دوبه ر يكه ر
schismatist ,n=schismatic
schismatize , vi , t دوبه ره كى دكت
schist , n كه فرىٰ چينين تيڤه لين كانى
schistose , adj پيوه نديدارىٰ كه فرىٰ چينين تيڤه لين كانى
schisto some , n كرمىٰ خوين ميزكى
schistosomiasis , n خوين ميزيتى ( بلهارزيا)
schizonthus , n ته خليت گولان : سپى ، بنه فشى ئو قرمزى
schiz (o) پيشگره كو كه لشه
schizo , n ترازانك
schizocarp , n ميوه يه ك هشك ( ل گه هشتنىٰ يه ك به ركه )
schizogenesis , n زائوزىٰ يا كه لشينى
schizoid , adj ترازانى
schizomycete , n هه له زه ك يه ك خانه وه ك كه ڤز يان كڤاركى ئو ب كه لشبونىٰ زه حف دبت
schizophrene , n ترازاندار
schizophrenia , n ترازان
schizophrenic , adj ترازانى
schizopod , n , adj پىٰ كه لشى
schizopodous , adj پىٰ كه لش
schizothymya , n ترازانباريتى
schizothymic , adj ترازانى
schmaltz , n هشا شه كرى
schnorkel , n , vi ئالافكا باكيشانا نوقارىٰ ، با دكيشت
scholar , n پشكتيار ، زانا . تويژه ر، هوزانڤان مه له ستڤان . هوزان ، پرزانا
scholarly , adj ره وشه نبير ، زانا ، پسپور
scholarship , n زانيارى . ره وشه نبيرى . ناس به خشا خوه ندنىٰ
scholastic , adj , n دبستانى . ژيريبژى يى ، زانكويى
-agent نوينه رىٰ كارى بوٚ سه يدايان په يدادكت
- theology ئولزانى يا هور
scholastically , adv ب راڤه كرنى
scholasticism , n راڤه كرنيتى
scholiast , n راڤه كه ر.په راويزكه ر ، ريزمانزان . لينو انكار
scholiastic , adj , n ريزمانزانى ، راڤه كه رى . لينوانى
scholium , n راڤه . تيبينى . په راويز
school , n , vi خويندنگه ، هينگه . خوه نده گه . دبستان جه له بىٰ ماسى يان ، فيرگه .قوتابخانه.هين دكت. فير دكت
- bag , adj چه نته يىٰ دبستانىٰ
- boy شاگرد ، قوتابى
- certificate فيرنامه
- days روژين دبستانىٰ ( به رىٰ )
- master ماموستا . سه يدا
- primary دبستانا سه ره تايى
- secondary دبستانا ئاماده يى
schoolable , n دبستانبار
school board , n جڤاتا دبستانىٰ
school book , n كتيبا دبستانىٰ
school edition , n چاپا دبستانى ( كتيب )

school fellow , n هوگرێ دبستانێ
school girl , n کچکا ل دبستانێ
school house , n ئاڤاهی یێ دبستانێ
schooling , n تێچونا فێرکرنێ . راهینان . په روه ر ده کرن، هینکرن ، دبستانی
school inspector , n پشکنه رێ دبستانێ
schoolman , n کاردارێ دبستانێ . سه یدا ، ماموستا
schoolmaster , n سه یدا یان کاردارێ دبستانێ
schoolmate , n هه ڤالێ دبستانێ
schoolmistress , n کاردارا دبستانێ ، هینکه ر ( ژن )
school teacher , n هینکه ر ، سه یدا
school time , n ده مێ خوه ندنێ
schooner , n که شتی . گه می یا بابره کی ، ترارێ مه زنێ بیره یێ
shorl , n به ره ک ره ش نیف هێژا
schuss , n , vt , i حلسینا راستا گه له ک له زین ، نشیفی یا حلسینێ . حلسینێ دکت ( نشیف )
schwa , n ده نگێ بزوینێ نه دیار
sciagraphy , n هونه را تاریکرنێ ل نه قشکرنێ ، وینه گری یا تیرێژا ئێکس
sciagram , n وینه یێ تیرێژا ئێکس
sciamachy , n شه رێ ئاشوپی
sciatic , adj که ماخی . ژانه رهی
- artery سور ده مارێ که ماخی
- nerve شین ده مارێ که ماخی
sciatica , n ژانه رهـ . رهـ ئێشان ، رها بایی . رهـ ئێش
science , n زانین . زانیاری . زانست . هین زانستی . زاناتی
- applied ..... زانستی یا راهینی
- pure ...... زانستی یا بژین
- .....fiction ئاشوپی یا زانستی
- of law یاسازانی
scienter , adv بریاره کی ، ب زانینی ، ب ژیری
sciential , adj زانینی
scientific , adj زانستی
- books کتێبێن زانستی
- institute زانینگه
- method رێباز ا زانستی
- terminology زاراڤاتی یا زانستی
scientifically , adv ب زانستی
scientification , n ئاشوپکرنا زانستی
scientism , n زانستیتی
scientist , n زانا . هینا . زانستدار ، زانیار
scientize , vt زانستی دکت ، زانستی چاره دکت
scientized , adj زانستیکری ، زانستی چاره کری
scientizing , n زانستیکرن، زانستی چارکرن
Scientology , n سنتولوجیا:ئولا ئایینی یا زانستی کو کارێ گیانی ل سه ر بونا مادی یه
scilicet , adv ئانکو
scilla , n هه له زه کوه ک زه باتی یه
scimitar , n شورێ چه مایی
scintigraphy , n وینه گری یا ئه ندامێن له شی
scintilla , n تبابه ک . گه ردیله
scintillant , adj چریسکی . ته یسی
scintillate , v . i . t دته یست ، دچریست
scintillated , adj چریسی
scintillating , n ته یسین
scintillation , n کلپه ، تروسکه
scintollo counter تروسکه ژمێر
scintollomcter , n = scin tollo counter
sciolism , n زر زانایی
sciolist , n زر زانا
sciolistic , adj زر زانایی
sciomancy , n به ربینی یا ساویری ( به ربینی ب ساویرا مری )
scion , n تملوک . نه ڤی ، براله
scirrhoid , adj په ژیوه ک په ژبونا تیراله یا ره ق
scirrhosity , n په ژیتی
scirrhous , adj په ژی
scirrhus , n په ژیتی
scissile , adj بردار . که لشدار
scission , n برین . دابه شبون
scissor , v . t دبرت

scissors , n (pair of) جاوبڕ
- and paste دانانا کتنیان ژ برینا کتنبێن دی
sciuroid , adj سفوره یی
sciurine , adj ژتوخمێ سفوره یی
scler (o) پێشگره کو ره قه ، هشکه
sclera سپیلکا چاڤی
sclerenchyma , n ته قنێ ره قێ خانه یێ
scleriasis , n مشکبونا ته قنی
scleroserma , n چه رم هشکی ، قه شامی
scleroid , adj ته قن هشک . هشک
scleroma , n ره قبونا ته قنێ مری
sclerometer , n هشکی پیڤ
sclerophyll , sclerophate , n هه له زا تیر ته قن ره ق کو نا دهێلت ئاڤ زه هێ ببت
sclerose , vt , i ره ق دکت . ره ق دبت
sclerosed , adj ره قبویی
sclerosis , n ره قبون
- disseminated .... ره قبونا به لاڤ
- multiple ...... ره قبونا که ڤنا ته قنێ مه ژی ئو کاریته یێ پشتێ
sclerotic , adj , n پێوه ندیدارێ ره قبونا ل دورسپیلکا چاڤی ، په رده یا ره قا سپیلکا چاڤی دگرت
sclerotitis , n ره قبونا په رده یا سپیلکا چاڤی
sclerous , adj ره ق . ره قبویی
scobs , n بینه
scoff , n , v . i پێکه نین . ترانه . ته ڤز ، پێدکه نت . ترانه دکت
scoffer ,n ترانه که ر
scoffing , n ترانه ، حه نه ک . ته وز
scold , n . v . t . i تێخورین ، ره زیل دکت . دخورت . تێدخورت
scolding , n سه رزه نشت . ته هاندن . لێهلاتن . ره زیلکرن
scolex سه رێ کرمێ شه لیتی
scoliosis , n لادانا ره خه کی یا کاریته یێ پشتێ
scollop , n, vt . i = scallop

scolopaceous , adj وه ک تقیرکی ( بالنده )
scolopendra , n زوف ، سه دپێ
scolopendrine , n سه دپێ یی
scolopendriun , n هه له زا سه رخه س ( گه ز ؟ )
scombler , n ته خلیت ماسی یه
sconce , n , v . t کلوخ ، هش ، چه په ر . موم . کێلکا نه رم .سکرێ ئاخێ سزا . سزا دکت، چه په ر دکت.ئاسێ دکت
scone , n کلوجا پانا گروڤر
scoop , n هه سکو . هه سکه . چه مچه . که مچی ، سمکوت . چه مچک . هه سک .که ڤگیر
- net تورا هه سکی ( بۆ مالشتنا بنێ روباری )
scoop , v . t ب هه سکی دبت . ب هه سکی ڤالا دکت،( زوتر ) نوچه یی به لاڤ دکت
scooper , n به لاڤکه رێ زوترێ نوچه یی
scoot , n . v . i ده رکه تنا له زین ، ب له ز دچت
scooter , n یه ک چه رخ ( بۆ زارویکی )
scooterist , n هاژوێ دوچه رخا بزوینه ری
scopa , n (scopula) گولی یا موێ بچوکێ وه ک فرچێ نه خاسمه ل سه ر لنگێن مێشان
scopate, scopiferous= پێوه ندیدارێ گولی یا موێ بچوکێ
,scopiform,scopulate= وه ک فوچه یی ل سه ر
, scopuliform , adj لنگێن مێشان
scope , n دوربین . په رده یا رادارێ ، مه ره م.ئارمانج.ده لیڤه.مه ودا ساوه
- scope پاشگره کو بینه
scopolamine , n ماده یه ک نیڤ تفتی ژه هره
- scopy پاشگره کو دیتنه
scorbutic , adj نه سکه ربوتی ( نه ساخی )
scorch , n , v , t , i شه وات . سوتنا روویه کی ، ره شبونا ته قنێ هه له زی ژ به ر نه ساخی یێ یان گه رمی یێ، ب له ز دهاژوت ، دگه زت ( ب ترانه یێ) نه ردی ئو سامانی دسوژت .
scorcher , n که ل . شه وات ، نه خاسمه روژا بێقام گه رم

scorching , adj سوتان ، ئاگرناک ، گه زین . که ل
scorchingly , adv ب سوتنی
score , n , v . t . i کین . هو ، هان ، بابه ت ، بیست ، برین . خرمشین . نیشانا ده ستپێکێ یان توماهی یێ ، ژمار . ده ین . نیشانا ژمارتنێ ، پێکان . ئه نجام . سه رجه م ، دژمێرت . تومار دکت دخرمشینت . ل ئارمانجێ ددت
- on more...s than one ژ هویه کێ پتر
- on that ........ ژ وی لایێڤه
- to pay (settle) old ..s تول ڤه دکت
scoreboard , n ده پێ پێکا نێ
scorekeeper , n تومارکه رێ پێکان
scorer , n تومارکه رێ پێکان ، یاریکه رێ پێکان دبت ، نیشاندار
scoria , n پاشمایی یا مێرتالێ بوهوژی
scoring , n نیشانداری . ڤێکه تن . پێکه تن
scoriaceous , adj ژ پاشمایا مێرتالێ بوهوژی
scorification , n راکرنا پاشمایا مێرتالی
scorify , vt پاشمایا مێرتالی رادکت (ب بو هوژینێ)
scoring , n ڤێکه تن ، پێکه تن
scorn , n , v . t ئافر . ته ڤز ، نزم دکت . کوت دکت
- to laugh (somebody) to . ترانه پێ دکت
- to take (or think).. کوت دکت
scornful , adj رسوا . ترو . ته ڤزدار
scornfully , adv ب رسوایی
scornfulness , n رسواییتی ، تروییتی
scorpaenid , n , adj دوپشکی
Scorpio , n دوپشک ( برج )
scorpioid , n , adj دوپشکی
scorpion , n دوپشک
- fish ماسی دوپشک ، دوپشکێ ده ریایی
- fly مێش دوپشک
- grass گیا دوپشک
scorzonera , n گێز به لوکا ره ش
scot , n پاره دان ( وه ک باجا دوکه )
- and lot بارێ بازێری هه لدگرت
- free بێ زیان
Scot , n سکوتله ندی

scotch , adj , n , v . t سکوتله ندی ، وسکی . شه قیته ک دخر مشینت . دهه رشینت . ته په سه ر دکت ، گیرو دکت
- man سکوتله ندی
- tape شه لیتا شه قیته کێ بژ ڤه نوسینێ
- terrier سه یه ک نێچیرێ لنگ کورته
- verdict بریارا نه ڤه بڕ
- woman ژنا سکو تله ندی
- woodcock هێکێن ل سه ر ماسی یا نه نکوڤی یا برازتی یێ ل سه ر نانی
scoter , n وه رده که ک ده ریایی مه زن
scot - free , adj ساخله م . بێ سزا . بێ باج
scotio , n قالبێ رۆچال . نه خاسمه ل بنێ کاریته یێ
Scotland Yard , n سکوتله ند یارد( پولیسێ له نده ن )
scoto پێشگره کو تاری یه
scotodinia , n گێژیتی
scotoma , n تاریتی : پنی یا تاری ( یا دیتنێ )
Scots , adj , n سکوتله ندی
- man سکوتله ندی
scotticism , n سکو تیتی
scotticize , vt سکوتی دکت
scottish , adj سکوتله ندی
- rite نولا سکوتله ندی
scoundrel , adj گاریس . رۆره ش . چه په ل
scoundreldom , n گاریسی . چه په لیتی
scoundrelism , n چه په لیتی . گاریسیتی
scour , n , v . t ڤه مشتن . پاقژکرن . زکچون ، پاقژ دکت . زک دچت . ڤه دمشت
scoured , adj هه سکاندی . پشافتی
scourer , n پاقژکه ر
scourge , n تاژانک . کاره سات . بوبه لات سزادکت . چه لده ددت ، ئه شکه نجه ددت . دژوار ره خنه دکت
scourged , adj ( دژوار ) سزاکری
scourging , n چه لده کرن

scouring , n هلپشافتن . پشافتن
scout , n , v . i چاپۆک . چوست ، پێشره و ، پێشه نگ
. لاوک ، دیته ڤان . مروڤ ، گه ریده .
دیده ڤان ، لێگه ر وک . رێبه ر . نێره
ڤان ، زێره ڤانی دکت . سه ح دکت .
ترانه پێ دکت
- car ئوتومبیلا گه ریده
- master رێبه رێ پێشه نگان
- 's camp هوبه ی چاپوکان
scouter , n پێشه نگ . سه حکه ر . نێره ڤان
scouting , n نێره ڤانی
scouts , n چاپو ک . پێشره وان
scow , n سه نده ل . ئامان . ته خلیت به له م
scowl , n , vi , t مروس . رۆتالی،مروس دبت .مریتو دبت
scowling , n رۆتال . رۆته حل . مچ ومر ، مروسی
scowlingly , adv ب رۆتالی ، ب مروسی . ب مچ ومری
scrabble , vi ( بێ سه ر وبه ر ) دنڤیست
scrabbled , adj بێ سه ر وبه ر نڤیسی
scrabbling , n ( بێ سه رو به ر ) نڤیسین
scrag , n, v , t مروڤ یان جانه وه رێ له ش لاواز ،
گوشتێ ستویێ په زی . ستویێ مروڤی
ستویی دشکینت ، سیداره دکت
scragged , adj سیداره کری . ستو شکاندی
scragging , n سیداره کرن ، ستو شکاندن
scraggy , adj باریک . لاواز . زراڤ
scram ! interj ! ویدا ! ویدا هه ره !
scramble , n , v . i . t خوشین . هلپرژین ، پالدان ( ب ملان )
کوم دکت یان ب ده ست دکه ڤت
( نه ره وا ) ، دخوشت . هلدپرژت ،
پالددت .له زدکت( بزدهایی )تێکل دکت
scrambled , adj پالدایی
scrambling , n پالدان
scrammed , adj جهدا ویڤه چویی
scramming , n ویڤه چون ( جهدا )
scrannel , adj لاواز ( ده نگ ) . ره ق ،
نه مه زیقه یی ( گوهی دئێشینت )
scranny , adj باریک . زراڤ

scrap , n پاشماوه . سرین
- book تومارا برێ یان
- heap کوما مێرتالێ هاڤیتی
- iron ئاسنه واله ، ئاسنێ هاڤیتی
scrap , vt دهاڤێت .چنی دکت،دشکینت ، دهێلت
scrape , n , vt ته نگاڤی . ڤه ره نین ، ڤه دره نت
scraped , v ڤه ره نی
scraper , n ره نه ک
scrapie , n نه ساخی یا خورینی یا په زی
scraping , n چه لتاندن . ڤه ره نین . لێلکرن .
ڤه روتن
- off ڤه ره نین . داتاشین
scrapper , n شه رکه ر
scrapple , n رهکێن به رازی : قیمه یێ گوشتێ
به رازی ل گه ل ئاری وه ک رهکان
دقه لینن
scrappy , adj شه رکه ر . شکه سته کی ، ده ست
دریژ
scratch,n,adj, v , t , i شه قیته ک . شه قتی . شه قتین
خورین . روشان . چرنوک
دخور مشینت . دخورینت
scratched , adj (off) شه قتی
scratchily , adv ب خورینی
scratchiness , n خورینیتی
scratching , n , (off) روشاندن ، خوراندن . ڤه ره نین .
ڤه راندن ، شه قتاندن . ڤه روتن
- ground گه ڤزک
- up to ...... وه ک مه ره مێ
scratch line , n خالکا ده ره تنێ (ل پێشبرکێ )
scratch paper , n کاغه زا ره شنڤیسێ
scratch sheet , n وه شینا هه سپێن ژ پێشبرکێ کشایین
scratch test , n ئه زمونا هه ستیاری بۆ ده رمانی
scratchy , adj در . تێر ستری . خورینی ،
نه راموشی ، به رپه کری .
نه لێکدایی . چیره چیری
scrawl , v . i . t بێ سه ر و به ر دنڤیست یان
نه قش دکت

scrawny , adj باریک . لاواز
scray , n بالنده یه ک ده ریایی
screak , n , vi قیژ ، قیژدکت
screaky , adj قیژی
scream , n , v .t . i هاوار . قیر . قیژ ، قارقار . قیر قیر .
قورین ، قیژدکت . قیردکت ، دقورت
screamer , n قیژکه ر
screaming , n قیژکرن ، قیرکرن . قژاندن . قیژین ،
زاره زار . قورین
screamingly , adv ب قیژی
screamy , adj قیژی
scree , n به ر . به رک . کوما به رکان
screech (ing ) , n قیژا ترسێ یان ژانێ . چیر ڤه چیرک .
چیر چیر
screech , vi , t قیژد دکت ( ژ ترسا یان ژانێ )
screech owl , n کونده به بویا قیژکه ر
screed , n گوتارا دریژ . په یڤ یان گوتارا
نه میری ، دارێ نیشان بۆ ستوری یێ
screen , n ; v . t سکر . به ربه ست ، به ند . په رده ،
سه ره ند ، بیژینگ . نافبه ره ک ،
رۆبه ند ، ریق، ڤه رادکت . په رده دکت
- land پیشه سازی یا سینه مه یێ
- play ده قێ سینه مه یی
- test ئه زمونا په رده یی
screenable , adj په رده دار
screened , adj به ربه ستکری ، په رده کری .
ڤه راکری . ریقاندی
screening , n ڤه راکرن
screen - test , vt , i په رده ئه زمون دکت (رۆلێ نو)
screw , n , vt , i پێچه ک ، بزمارێ باده ک . بادوکه . .
بورغی . چه ر ، پێچ ، بادت
- axis ته وه ره ی بادوکه یی
- eye ره زینه ک . ره زه . زه رزینه ک
- to give somebody another turn of the... پتر دگڤێشت
- to put the....on somebody مروڤه کێ دگڤێشت
- to have one,s head ....ed په ند ئوقه نج هزر کرن
- to ....out ب زوری دستینت
- to ...up one's courage ل خوه ددت
- to ...up one's eys چاڤان نیڤ دنه قینت
- to ...up one's face مچ و مر دبت ، مروس دبت
screwball , n , adj گه وج
screwdriver , n باده ک ، چه ر باده ر
screwpine , n داره ک ئوسترالی باسک زراڤ
وه ک دار قه سپی
screw propeller , n په روانه یا لوله کی
screw thread , n ددانێ لوله یێ
screwy , adj دینوکه . گه وج . خرپو
scribble , n , vt , i نڤیسینا بێ سه ر و به ر ، بێ
سه روبه ر دنڤیست
scribbler , n نڤیسه رێ پوچ . نڤیسه رێ بێ
سه ر و به ر
scribe , n , v . t دانیار.دانه ر.رۆنڤیسه ر.نڤیسه ر.میرزا
، هیلکه ر.دخرمشینت یان نیشان
دکت ، ب ئالاڤه ک تیژ دنڤیست
scribed , adj نڤیسی . میرزاکری
scriber , n هیلکه ر. چه ته لا نیشانکرنا داری
یان میرتالی به ری برینێ
scribing , n میرزاکرن ، نڤیسین
scrim , n په روکێ په مبویی بۆ جل ئو په رده
یا په نجه رکا
scrimmage , n , v . i گه لج . راهشتن ، به زما بچۆک .
لیکه تنا هه رایی ، رادهشت
scrimmaged , adj راهشتی
scrimmaging , n راهشتن
scrimp , v . t . i کیم دکت .ده ست دمچت ، چکوسی
دکت
scrimpy , adj کیم . پچه ک . لاواز
scrimshaw , n , vi , t ئاجا تراشی ، شه هره زا کاره ک
ئامیرگه ر به رپه دکت ، تراشی یێن
ئاج یان هه ستی چێدکت
scrip , n قوچان . باوه رنامه ، سیایی ، جخز
دراڤێ کاغه ز . پارچه یه ک بچۆک
script , n نڤیسین .ئه لف وبێ ، ده قێ نڤیسی
. ده ستنڤیسین ، قوچانا ره سه ن
- writer ده ق نڤیسه ر
scriptorium , n نڤیسینگه
scriptural , adj ئنجیلی

tongue , vt , i — دئالیست . زمانوک دکت . وه ک زمانی دریژ دکت ، فرینزی ڤه ددت

tongue and groove , n — مولکا زمان ئو که لشی

tongued , adj — ئالیستی ، زمانکری . زمان ره وان

tongue - lash , vt , i — ده ڤێ خو لێ ڤه دکت ، گازنده دکت

tongue - lashing , n — سه رزه نشت . گازنده کرن

tongueless , adj — لال ، بێ زمان

tongue - tied , adj — زمان گرتی

tonguing , n — ئالیستن ، زمانکرن

tonic , adj , n — تنگژینی ، هێزده ر . بریار . بنیات . ئاوازی . ده رمانێ قایمکه ر . قایمکه ر ، ڤه ژین

- accent — برگه خورتکرن

tonic major and minor , n — کلیلێن هه مان سه ره ک ئاواز

tonicity , n — ئاوازیتی . خورتی . ساخی

tonight,to -night,adv — ئه م شه و . ئیشه ف ، ئه ف شه ڤه

toning , n — ئاوازکرن

tonish , adj — باو . موده

tonite , n = tonight

tonka bean , n — توڤێ ره شێ بێهن خوه شێ باشورا ئه مریکا

toneless , adj — بێ ئاواز

tonelessly , adv — ب بێ ئاوازی

tonelessness , n — بێ ئاوازیتی

tonnage , n — باجا سه ر بنیاتا ته نێ ، گرانی

tonne , n — ته نا مه تری ( ١٠٠٠ کغم )

tonner , n — که شتی یا چه ند ته ن

tonometer , n — ئاواز پیف

tonsil(s) , n — هه ستیک . ئالو . هێستل . گلاله

tonsillar , adj — گلاله یی . هه ستیکی

tonsillectomy , n — هه لکێشانا هه ستیکان یان گلاله یان

tonisillitis , n — کولبونا گلاله یان . هه ستی که تن . ئالو که وتن . گلاله که تن

tonsillotomy , n — هه لکێشانا هه ستیکان یان گلاله یان

tonsorial , adj — به ربه ری . تراشی

tonsure , n , vt — تراشینا هه می سه ری . ( سه ری ) دتراشت

tonsured , adj — تراشی

tonsuring , n — تراشین

tontine , n — ته خلیت دابینکرنا ته قره یان هه قره یی ( کو یه ک بمرت ماف دگه هت ئه وێن ماین )

tonus , n — تنگژینا زه بله کێ راست

tony , adj — موده ، باو

too ,adv , adj — زێده ، بێقام . گه له ک . دیسا . دیسان . ژی

took , (p . of take ) — بر

tool , n — ئه وزار . ئامراز . ئالاف . ئامیر . که ره سه ـدار ده ست ، که ره سته

tool , vt — به ر دتراشت

tool engineering , n — ئه ندازی یا ئالافان

tooler , n — هلکولکێ هوستایی ( ئالاڤکه ر ) بۆ به رتراشی یێ

toolholder , n — ئالاڤگر

toolhouse,toolshed,n — عه مبارا ئالاف یان که ره سته یان

tooling , n — به ر تراشین

toolmaker , n — که ره سته چێکه ر . ئالاف چێکه ر

toolroom , n — ژورا ئالاف ئو که ره سته یان

toomuch , adv — زێده

toon , n — تون . داره ک ئوسترالی یه

toot , n , vt , i — فیتک . توتیکان توتیک . ده نگێ توتیکێ، فیتک لێددت. توتیکێ لێددت

tooth,n,vt (pl. teeth) — ددان . ددان دکت

- canine ...... — ددان تیژ

- incisor ..... — ددان بر

- molar........ — ددان هێران

- ache — ددان ئێش . ژانه ددان

- billed — نکل ددانکرن

- brush — فرچه یا ددانان

- caries — ددان کلور ، ددان کرمی

- extraction , n — ددان هه لکێشان

- paste — هه ڤیرێ ددانان . ده رمانێ ددانان

- pick — دارکێ ددانان

- pick plant — خلتان

- powder — توزا ددانان ( بۆ پاقژکرنێ )

toothed , adj ددانداز . ددانکری
- or serrated stone که ریپچ یان به رێن سه رێ دیواری بۆ ئاڤاکرنا داهاتی . شاخور
toothful , n فره ک مه ی
toothing , n ددانوک
toothless , adj بێ ددان
toothsome , adj دلکێش ( زایه ندی )، تامدار . خوه ش خوارن
toothy , adj ددان چیق
tootle , vi , t توتیک : نازک ، دوباره یی یان به رده وامی لێددت
tootsy , n پێ
top , vt سه ری رادکت یان دبرت . سه رده ڤک دکت . بلندتر دبت
top , n , adj , adv ئه ڤراز ، پوپ ، نیک ، ته وق . دوچک . ژۆر . لوتکه . سه ر . گوپیتک . کومک ، له پزوک ، بالا ، راسه ر .
- fatty layer سه رتوک ، تو
topaz , n کانێ روهنێ سلیکێتێن ئه لومنیوم ( گه وهه ره ) ، توپاز
topazolite , n به رێ هێژاینێ زه ر یان که سک (سه وز )
top billing , n یه که م پایه
top boot , n پێلاڤا قاچ درێژ : ( جه زمه )
top coat , n پالتو یان قاپوتێ سڤک
top dog , n ده ست هه لاتدار ، سه روک زال
top drawer , n چینا بالاترا جڤاک ده ست هه لات یان به رێژاری
top - dress , vt ( رێنێ – زه ڤی یێ ) زبل دکت
tope , n په یکه رێ بوودی . بیستان . سیماسی یه ک بچوزک
tope , vt بێقام ڤه دخوت ( مه ی )
toped , adj بێقام ڤه خواری
topee , n = topi
toper , n به نگ . ڤه خوه ر
topflight , n = top drawer
topful (l) , adj سه رداچویی . تژی
top gallant , n بابره کێ بلند ، به رزی . بلند . گوپیتک پارچه یاسینه ما ( بلندا ) دارێ بابره کی
top hat , n کولاڤێ میری
top - heavy , adj سه رگران
tophet , n دوژه
top - hole , adj نایاب
toph (us) , n که ڤرێ زڤرێ برکانی ، پرکا خیزی یا موئک کولی یان ل دور ددانان
topi , n کولاڤ ، شه فقه
topiary , adj , n باخچه یێ لێکداینێ گولان، لێکدایی . تازه کری . که زاختی
topic , n مژاد . بابه ت
topical , adj بابه تی . هه بیه ری . مژادی
toping , n بێقام ( مه ی ) ڤه خوارن
topknot , n خشلێ سه ری ( په ر ، شه لیت یان گول )
topless , adj سینگ به ر دایی
top lift , n ته به قه یا ژێری یا پنی یا پێلاڤێ
toplofty , adj (also top loftical ) قاپان . بونک
topmast , n پارچه یا ( ناڤی ) یان دووه ما دارێ بابره کی
topmost , adj بالاتر . بلندتر
topnotch , n گوپیتک
top - notch , adj نایاب
topnotcher , n تشت یان مروڤێ نایاب یان پایه به رز
topographic , adj پێوه ندیدارێ رۆژه ڤیزانی
- relief هه له ت
topography , n رۆ زه ڤیزانی
topologicla , adj پێوه ندیدارێ زانینا ئه ندازیاری نو پێوه ندی یێن ڤالاتی یێ
topologist , n زانایێ زانینا ئه نداز یاری نو پێوه ندی یێن ڤالاتی یێ
topology , n زانینا خوه ندنا رۆچکێن ئه ندازیاری نو پێوه ندی یێن ڤالاتی یێ
toponym , n ناڤ ئه ردناسی یا ده ره کێ
toponymy , n ده ر – ناڤزانی
topped , adj سه رکری
topper , n تشت یان مروڤێ نایاب

topping , n , adj تشت ( وه ک بارسته یێ پورێ یان
په رێ ل سه ر گوپیتکێ. شکودار . بلند.
نایاب ، بالا، ته به قه یا سه رێ یا
شرینایی چقێن ( که زاخێ ) هاڤێتی
topple , n , vi , t ئێخستن ، دکه ڤت . دکه ڤینت ، دئێخت
toppled , adj که ڤاندی
toppling , n که ڤاندن . ئێخستن
tops , adj سه رکه تی ، ( باشتر ) ژ هو گرا
top secret , adj بیقام نهینی
top sergeant , n سه ره ک چاویش
topside , n ده ست هه لاتی یا بالا . ره خێ بلند
topside (s) , adv دنیڤه کا ده ست هه لاتی یان هێزێدا ل
سه ر پشتا گه می یێ ، بۆ یان
ل سه ر پشتێ یان پارچه یا بلند
topsoil , n ئاخا سه رڤه
top speed , n له زترین . له زا ئه ویه رێ
topsy turvy , adv , adj , n , vt به ره و ڤاژی . سه روبن
سه روبن دبت
toque , n کولاڤ
toquilla , n ریشالێن به لگێن داره ک باشورا
ئه مریکا وه ک دارقه سپی
tor , n زیر . شاخ
torah , n ته ورات
torc , n = torque
torch , n میله ده . پیل . خه تیره . مه شخه ل .
چرا . بلیسه
- fishing ماسیگرتناب چرایی
- light چرا . مومک
torchere , n مێزا شه مالکێ
torchon , n ته خلیت کلوشێ کتانی یان په مبو
- board مێزا ب کاغه زا زڤر نخافتی
- paper کاغه زا رۆ زڤر ( بۆ نه قشێ ئاڤ -
ره نگان )
torchwood , n دارێ چرایان
tore , (p . of tear ) چریا . دریا . دڕاند . چراند . چرتکی
toreador , n گا شه رکه ر ( سوار )
torero , n گا شه رکه ر ( په یا )
toreutic , adj , n ژ نه قشێ ده رکه تی یێ مێرتالان
toreutics , n هونه را نه قشێ ده رکه تی یێ مێرتالان

torgoch , n ماسی یه ک زک سور
toric , adj وه ک قه پوچکی
torii , n ( pl . same ) ده ریکێ په رستگه یێ شینتو
torment , n جه فا . ده ر دمه ندی . ئارمان .
ئازار . ئێش
torment , vt ئه شکه نجه دکت . ئازار دکت .
دئێشینت
tormented , adj دل ئازار . ئێشاندی
tormentil , n گیایێ گول زه ر
tormenting , n شکه نجه دان. ئێشاندن . ئازارکرن
tormentor , n . (also tormenter ) ئازار دایه ک . ئه شکه نجه که ر
tormentress , n ئه شکه نجه که ر ( مێ )
tormina , adj , n ئێشا دژوارا هناڤان
torn , (pp . of tear) چڕهایی . شڕ . دڕاندی . دریایی
- down هلشاندی
- to pieces په رتی
tornadic , adj باهوزی
tornado , n باهوز . باهوزا بابه لیسکی ، بوران
toroid , n شکلێ وه ک کوڤزی
toroidal , adj وه ک کوڤزی
torous , adj (also : torose) ستونی
torpedo , n , vt هاڤێژا خو کاری بۆ تێکشکاندنا
گه می یێن دوژ منی. کوژ یان
خوینرێژیێ پیشه کار، توربید . مێن یا
نوقاران، توربید دکت، توربید لێددت
- boat شه رکه شتی یا بچوکا له زا توربید
هاڤێژ
- boat destroyer شه رکه شتی یا تێکشکێنا گشتی
- body له شێ توربیدی ( بۆ پێشبرکێ )
- gun boat تێکشکێناشه رکه شتی یێن توربیدان
- tube لوله یان هاڤێژا توربیدێ
torpedoed , adj توربید لێدایی
torpedoing , n توربید لێدان
torpefy , vt ته زی یان مت دکت
torpid , adj سار ، ته زی . مت
torpidific , adj ته زی . مت

torpidify , vt مت دکت
torpidly , adv ئە زیکە رە کی ، ب متی
torpiditor , adj متدار
torpidity , n متی
torpidness , n متیتی
torpor , n گە وجی . خە وا ئە مار . ئە قزی
torporific , adj ئە زیکە ر
torquate (d) , adj ستۆانکی پێ بازنی
torque , n زەبری یا بادانێ ، ستۆانک ( ژ میزتالێ بادایی )
torqued , adj زە بریکری
torquing , n زە بریکرن
torquoise , n پیروزە . فە یروز
torr , n یە کە یا پە ستانێ بژ پیڤانا ڤالاتی یا پارچە یی (١ / ٧٦٠ ژ پە ستانا ئە سمانی )
torrefaction , n براژتن . زوها کرن . قە ماندن
torrefy , vt بقە مینت . زوها دکت . ببرێژت
torrent , n تیراف . شاپ . خشیک . نهێل . لە هی . لە یی . تاڤی . ئە شقە لی
- sudden ...... شاپ
torrential , adj شاپی ، لە هی یی . زە حف
- rain لە هی باران
- sudden ...stream شا پ
torrentially , adv ب زە حفی
Torricellian,adj...experiment , n ئە زمونا توریچیلی : ب جیوه بژ پە ستانپیڤێ
torrid , adj ئە ردێ تاف سوتی.ئە ردێ بێقام گە رم
torridity , n ئە رد گە رمی
torridly , adv ب گە رمی
torridness , n ئە رد گە رمیتی
torse , n = wreath
torsel , n خە ملا ئالوز
torsion , n بادان . وە رگە ران
- balance ئە رازوی بادان ، ئە رازی یا بادانکی
torsional , adj بادە کی
torsionally , adv ب بادە کی
torsive , adj بادە کی

torsk , n تورسک ( ئە خلیت ماسی یە )
torso , n قورمێ پە یکە ری یان مروڤی . لە ش ( بێ سە ر و دە ست و پێ )
tort , n ئە رک ئە کرن ( شکاندنا ئە رکی ) زیان . چە وتی
- feasor , n مروڤێ ئە رک شکێن
torte کلوچ
torticollis , n ستو رە قی
tortile , adj بادایی . چە مایی
tortilla , n ( نانێ ) سە وک یان نورک ، نانێ گارسی یان گە نمێ شامێ . نانێ مە کسیکی
tortious , adj چە وت
tortoise , n کیسل فس . شکە فتالوک . کوسی . کیسە ل . کیسە لە . رە ق
- beetle کیزا کیسە لی
- shell هە ستی یێ پشتا کیسە لی
tortrix , n ئە خلیت پە لپە لیتک
tortuose , adj چڤو . بادایی . خاهر. خواهر. خوار
tortuosity , n قورمچین ، بادان . وە رگە ران
tortuous , adj بادایی . نولکان
tortuously , adv ب نولکانی
tortuousness , n بادایی تی
torture , n , vt ئە شکە نجە . ئە شکە نجی . ئازاردان . ئازارە ک . ئازار . ئازاری ، ئە شکە نجە دکت . ئازار ددت
tortured , adj ئازارکری . ئازاردایی .ئێشاندی . دل ئازار ، ئە شکە نجە دایی
torturer , n ئازار دایە ک . ئە شکە نجە کە ر
torturing , n ئێشاندن . ئازارکرن . ئازاردان .شکە نجە دان
torturous , adj ئێشانی . ئازاری . ئە شکە نجە یی
torturously , adv ب ئە شکە نجە یی
torula , n زنجیرە یا گوگی یا بە کتریا . قارچکێ وە ک هاڤە ینی
torus , n خشلا کوقزی . قە پوچک
Tory , n , adj پارتا پارێزکا را بریتانی . پارێزکار پارێزیار

Torism , n پاریزکه ریتی ، پاریزکار یتی ، پاریزیاریتی
tosh , n (sl) پوچ
toss , n , vt , i سه ر راکرن . تره کتبه کرن . هافیتن له دوه شت . ئالا دلقه وه رد گه رت (بناف نقیناندا) ، په ریشان دکت . به رمه قدان دکت . دهافیت ( پیل گه می ین) . دهافیت ( تره کتبه دکت) دهه ژینت . تیکل دکه ، قورت دکت .
tossed , adj هافیتی
tossing , n هافیتن
- coin هلافیتنا درافی
- up هلافیتنا درافی بۆ بریاردانی
tosspot , n به نگ ، مه خوار
tossup , n هافیتنا درافی بۆ بریارا پرسه کێ . پرسا به ختی
tot ,n , vt , i سه رجه م . قورت . زاروک سه رجه م دکت . دهه ژمێرت
total , adj , n سه ره جه م . کو . ته مام . هه موکی. هه می . هه مو . سه رجه م
- abstinence نه قه خوارنا ئێکجارا ( مه ی )
- ignorance نه زانینا هه موکی
- eclipse هه یف یان رۆژگرتنا هه موکی
- number هه ژمارا هه موکی
- tonnage گرانی یان باجا ته نی یا هه موکی
total (l) ed , adj سه رجه م مبوری،کوکری، سه رجه م مکری
total (l) ing , n سه رجه م مبون ، کوکرن
totalism , n زورداریتی ، هه موکیتی
totalistic , adj پیوه ندیداریێ زورداری یێ
totalitarian , adj زوردار
totalitarianism , n زورداری
totalitarianize , vt زورداری دکت
totalitarianized , adj زورداریکری
totalitarianizing , n زورداریکرن
totality , n هه موتی ، سه رجه م . تومه ری
totalizator , n ئالاڤا ژمارتن ئو دابه شکرنا گره وین پیشبرکێ یا هه سپان
totalize , vt , i هه موکی دکت . سه رجه م دکت . کورت دکت
totalized , adj سه رجه م مکری
totalizer , n ژمێرینک
totalizing , n سه رجه م مکرن
totally , adv لاپ . لاپده
- mad دین
totaquine or totaquina , n توتاکین . ده رمانه ک دژ تایێ
tote , n , vt گوهازتن . (بار گرانی ) ، بارکرن هه لگرت . دگوهێزت
totem , n توته م . تشته ک هه له ز یان جانه وه ر کو دکن هیمایێ مالباتێ یان ئیلێ ، پیت بۆ فێ مه ره مێ
totemic , totemistic,adj توته می
totemism , n توته می تی
totem pole , n کاریته یێ توته می ( هندوکێن سور ل به ر مالێن خو دچکلین )
tother , adj , pron ئه وێ دی
toties quoties هه رجار
totipalmate , adj تل پێکفه یێ هه موکی
totted , adj سه رجه م مکری
totter , vi , n له دوه شت . دخنگلت ، خنگلین . له قین . قه رکوسی
tottered, adj خنگلی
tottering , n له وه شین . خنگلین ، له قین . قه رکوسی
totteringly , adv له وه شینه کی ، ب له وه شینی خنگلی
tottery , adj خنگلی
totting , n سه رجه م مکرن
toucan , n بالنده یه ک ده فه را یه کسانه که ری یا ئه مریکا
touch ,vt , i , n ده ست لیدت، دملمست ، دهنگێلت هنگافتن . ملمسین . ده ستدان . هه نگاف . په لاندن . ده ست لیدان. ده ستکرن
- a.....of rheumatism روماتیز یان هونکا سفک
- and go گوهازتنا له زین (ژ خاله کێ بۆ ئێکه دی، بارێ هه ستیار یان مه ترس
- to ......down دانت، دئێت خارێ (بالافر)
- to ....off هور ئو شه هره زا رافه دکت

- to .......on نیزیک دبت . نیشان دکت

- to .......up دلفینت. هان ددت ، بژار دکت . راست دکت

- to .......upon نیشان دکت . نیزیک دبت

- to ......wood ده ست دکت داری : دژ ده خسێ

touchdown , n داهاتنا بالافرێ . گاڤا به ختی

touched , adj ده سدایی

touch foot ball , n ت پکا پێ یانا ده سدایی ( ت خلیت ت پکا پێ یانا ئه مریکانی )

touch hole , n کونا سوتنێ : کونا تفه نگێ یا سوتنا شوره یێ ( باروتێ )

touchily , adv ب گورنخی

touchiness , n گورنخی تی، به دمادی . هه ستیاری

touching , n هنگافتن . ده ست هافێتن . ده ستکرن. په لاندن . هلمشین . ده سدان

touchingly , adv ب هه ستیاری . ب ده سدانی

touch - me - not , n ده ست — نه که — من . هه له زه ک ده مارێن تولی له دبن هه که ده ست بکتێ

touchstone , n ئه زمون ، ئاوایێ ئه زمونێ . ئه زمونا زێری

touch system , n ریزکا ده سدانێ : ( رینیازا لیدانا تیپ نلیسی )

touch - type , vt , i ده سدانی تیپ نلیسێ دکت

touchy , adj ت قه یان سوتنبار ، بیتام هه ستیار . هور . به دماد . ئه نروک

tough , adj , n قه رت . زور باز . زه حمه ت . چه تین . دژوار ، تورت . قایم

toughen , vt , i قایم دکت

toughened , adj قایمکری

toughening , n قایمکرن

toughie or toughy,n مروڤێ ره ق ، پرسا زه حمه ت

toughish , adj پچه کێ هشک

toughly , adv ب هشکی

tough - minded , adj هش — کرداری ، ئازا . خورت

toughness , n ره قی . هشکی . قایمی

toupee , n ند پرچ

toupet , n به رێ زه پرچێ

tour , n , vi , t گه ریان . گه ران .رینیارنامه گه شت. ریڤنگی، ریڤنگی دکت، دگه رت.

- de force ( ئه رک ) هنه را هێزێ یان شه هره زایی یێ

- of observation گه ریده یا زێره ڤانی یێ

touraco , n . (pl . s) بالنده یه ک ئه فریقایی مه زن ( په ر سور ئو گه سک )

toured , adj گه ریایی

tourer , n گه ریده

touring , n ریڤنگی . گه رین . گه ران

- car گوهێزوکا ریڤنگی یان گه رانێ

tourism , n گه شت . گوزار و گه شت . گه ران. ریڤنگی . گه شتی . گه ر، رینگه ری

tourist , n گه شته وه ر . گه ریایی . گه روک . گه ریده . گه شته که ر . رینگه ر . ریڤنگ . گه شتوک ، گه شتیار

- card کارتا گه ریده (شونا په سه پورتێ )

- class پله یا گه ریده

touristic , adj گه شتیاری

touristically , adv ب گه شتیاری

tourmalin (e) , n تورمالین : به ره ک نیف هێژایه

- granite گرانیت یان به رسته یێ تورمالین

tournament , n پێشبرکێ . گه را پێشبرکێ ( ئالیه را چه ند یاریکه راندا )

tournay , n په روکێ گه ل وپه لی

tournedos,n.(pl same) گوشتێ چیلێ ( به زکری )

tourney , n = tournament

tourny , vt به شداری پێشبرکێ دکت

tourniquet , n بادانک یان په ستینکه ر بو راوه ستاندنا له ره سینا خوینێ

tournure , n گه ماخ مال

touse , n ئاژاوه

touse , vt گل دکت

| | |
|---|---|
| toused , adj | گلگری |
| tousing , n | گلگرن |
| tousle , vt , n | گژ دکت ، پرچا گژ ، پێژی |
| tousled , adj | گف . گژگری |
| tousling , n | گژگرن |
| tousy , adj | زڤر |
| tout , n , vi | سه حکه رێ نوچه یێن پێشبرکێ یا هه سپان ( بۆ گره وێ ) . گه روک (بۆ پشتگرتنێ یان کرێ یاران ، نوچه یێن ته وله یان سه ح دکت ئو سیخوری مه شقێن پێشبرکێ دکت (بۆ گره وان). ( ل بازاری ) دگه رت بۆده نگان . راڤه دکت،رادگه هینت، قه نج زێده ڤانی دکت |
| touter , n = tout | |
| tow , n , vt | به نکێ قه تاندی یێ کتانی، پێ رویکێ ڤی. به نکی، وه ریس یان زنجیرا کشانێ. کشان . گه می یان گوهێزوکا کشاندی، دکشت |
| - in ......... | کشاندی |
| - boat | به له ما کشاندنێ |
| - car | ئوتومبیلا کشاندنێ |
| towage , n | کشاندن |
| towing , n | کشاندن |
| towy , adj | کشاندنی |
| toward (s) , prep | به ر، به ر ب . به ره و . هه مبه ری . بۆ |
| - .....the sea | به ره ریاییڤه |
| - .......us | به رمه ڤه |
| towardly , adj | نه رم ، هیڤیدار |
| towel , n , vt , i | پێشکیر .ده ستمال . به شکیر . خاولی. پێ شته مال ، زوها . دکت . |
| towel (l) ed , adj | زوها کری (ب خاولی یێ) |
| towelling , n | خاولیکرن . زوهاکرن ( ب خاولی یێ ) |
| tower , n , vi | که لو . برج |
| - like | وه ک برجێ |
| - of strength | قایم . خورت |
| towered , adj | بلندکری . به رزکری |
| towering , adj | بلند . به رز |

| | |
|---|---|
| towery , adj | که لویی . برجی . بلند |
| towhead , n | پرچ کتانی . سه ر یان مرولێ پرچ نه رم سپی |
| towheaded , adj | پرچ کتان |
| towhee , n | سڤانوکا باکورا ئه مریکانی (بالنده) |
| towit , adv | ئانکو |
| towline , n | وه ریسێ کشانێ |
| town , n | بازار . بازێروک . شاروچکه . بازێر |
| - clerk | میرزایێ بازێری |
| - councillor | ئه ندامێ جڤاتا بازێری . راوێژه رێ بازاری |
| - crier | بانگێر . گازیکه ر |
| - hall | هولا جڤاتا بازێری |
| townee, townie, towny, n | بازێری |
| townhous e , n | خانی یێ بازێری |
| townsfolk,n.pl=townspeople | |
| township , n | بازێرک . ده ڤه ر |
| townspeople , n | بازێری ( خه لک ) |
| townsman , n | بازێری ( مروڤ ) |
| townswoman , n | بازێری ( ژن ) |
| towrope , n | وه ریسێ کشانێ |
| towtruck , n | بارکێشا کشانێ |
| tox (o) | پێشگره کو ژه هره ، ژه هری یه |
| toxalbumin , n | توکسه لبومین : ماده یه ک پروتینی ژه هری یه |
| tox (a) emia , n | ژه هربونا خوینێ |
| toxemic , adj | نه ساخێ ژه هربونا خوینێ |
| toxic , adj | ژه هری |
| - symptoms | به رژه نگێن ژه هری |
| toxicant , adj , n | ژه هر . ژه هری |
| toxicity , n | ژه هریتی |
| toxicogenic , adj | ژه هرزێ |
| toxicologic (al) , adj | پێوه ندیدارێ ژه هری زانی |
| toxicologically , adv | ب ژه هرزانی |
| toxicologist , n | ژه هرزان |
| toxicology , n | ژارزان . ژه هرزانی |
| toxicosis , n | ژه هربون |

toxify , vt — ژه هر دکت
toxigenic , adj — ژه هر به رهه مدار،ژه هرداری ژه هر زێ
toxin , n — توکسین . ژه هرین
toxoid , n — ژه هرینا لاواز کری
toxophilite , n — تیرباز . حه ز که رێ ئارمانج گرتنێ ، ئارمانج ستێرکخواز
toxiphilitc , adj — ستێرکخواز
toxoplasmosis , n — نه ساخی یا رێزکا نیڤه کی یا ده مارێن زاروکی
toy , n , adj — تشتێ بچوک . نه خاسمه جانه وه ر ، لەیزتوکی . له یزتوک . وەک له یزتوکێ. له یزوک، لەیستک ، لیستک ، له یستوک
- shop — فروشگه ها له یزتوکا
- soldier — سه ربازێ له یزتوکی
toy , vi — دله یزت
- to ... with — ب هزرێ دله یزت
toyon , n — ته یسوک : ته راشه ک ئه مریکانی به ر سور ته یسی
trabeated , adj — کاریته ئاسویی ئاڤا کری
trabeation , n — ئاڤاهی یێ کاریته ئاسویی
trabecula , n — به ریه ستک
trabecular , adj — به ریه ستکی
trabeculate , adj — به ریه ستکی
tracasserie , n — ئه نرینیتی
trace , n , vt — شون پێ . رێش . خشتته ک . خشینوک . نیشان . شون . شوپ . رێچ ، هودکت . له دگه رت . په یدادکت . له دگه رینت . شوپ دکت. شون دکت . نه قش دکت
traceability , n — شونباری
traceable , adj — شونبار
traced , adj — شونکری . شوپکری . شونکه تی
traceless , adj — بێ شون . بێ سه ر وشون
tracer , n — شوپگه رین . هێمانێ سه حکه ری ( تیرێژدار ) . هاڤێژا نه قشکه ر . نه قشکه ر . سه حکەر (نامه یان گورزه یان نه قشگه )
tracery , n — خه ملا چقدار ( داری )

trache (o) — پێشگره کو کرکروکه
trachea , n — زه نگه لور . کرکوک
tracheal , adj — زه نگه لوری . کرکروکی
tracheary , adj — پشینا کرکوکی یان زه نگه لوری
tracheate , adj — کرکروکدار . کرکروکی یان زه نگه لوری
tracheitis — کولبونا کرکروکی یان زه نگه لوری
tracheotomy , n — کونکرنا کرکروکی
trachoma , n — ته راخوما . قلتیش . چاڤ بیروڤ . بیروڤا چاڤان
trachomatous , adj — چاڤ بیروڤی
trachyte , n — تراکایت . که ڤره ک برکانی یه
trachytic , adj — تراکایتی
tracing , n — په یدوزی . نه قشه کرن. شونکه تن. دیڤکه تن . شوپاندن . دوڤکه تن نه خشه گرتن
- cloth — په روکێ شوپا تدنێ
- paper — کاغه زا شوپاندنێ
track , n , vt , vi — زنجیرا بوبه ر[illegible] . [illegible] مه یدان (پێشبرکێ) . [illegible] شون . بور . رێچ ، پانی یا گوهێزکی، پێشبرکێ یا مه یدانی، زێره ڤانی یا هێلا هاڤێژێ دکت . ب شوندا دچت . ل دوڤ دچت ، ده رباز دبت . دچت . کوچه ر دبت. شونا پێ دهێلت
- to ....down — دگرت . دگه هتێ
trackage , n — مافێ هه ڤکاری یارێ ئاسنی کو هێلەک هه ڤکاری یه ک ب کار بینت. کرێ یا ڤی مافی . هێلا رێ ئاسنی
track -and-field , adj — پێوه ندیداری پێشبرکێ یا مه یدانێ
tracked , adj — رێکری . شونکری
tracker , n — په یگه ر
tracking , n — په یدوزی
tracklayer , n — رێکێش
trackless , adj — بێ شون ، بێ رێ
- trolley = trolley bus

trackwalker , n  په یاپێ هێلێ : کارکه رێ به رپرسێ پاراستنا پارچه یه ک ژ هێلا رێ ئاسنی

tract , n  ئالاڤ . پارچه ئه رد . ده ر . وه شین . نامیلکه

- of sand  پارچه ئه ردێ خیزی

tractability , n  پێیری

tractable , adj  ده ست ڤیلک . پێیر

tractableness , n  پێیریتی

tractably , adv  ب پێیری

tractate , n  گوتار . نامه

tractile , adj  کشانبار . درێژبار

traction , n  لێخوشانا ڤه نوسینی . هێزا کشاندنێ . کشاندن . کشان

- engine  بزوینا کشانێ

- wheel  چه رخا کشانێ

traction al , adj  کشانی

tractive , adj  کشانی ، کشاندار

tractor , adj , n  راکێش ، تراکته ر

trade , n , adj , vt , i  پیشه گه ری . پیشه . کرین و فروتن بازرگانی، (ژبازاری ) دکرت ، بازرگانی دکت

- to ......in  پێک دگوهورت ( ل گه ل چودا به ها دانێ )

- to ......off  هه لگه ل ب کار دئینت . دفروشت

- - to ....on or upon  دئینت به ر . ئولام دکت

trade book  کتێبا بازرگانی ( بۆ خوه ندنا گشتی ) . چاپا بازرگانی ( ژ کتێبه کێ )

trade - board  جڤاتا بازرگانی یێ

tradecantia , n  گیایه ک هه ر شین ( گول مه زن : شین سپی یان سورێ ڤه کری )

traded , adj  بازرگانکری

trade - fair  نیشانگه ها بازرگانی

trade - in , n  په رتال یان تشتێ پێک گوهورکی

trade mark  شه ڤل وهێل . نیشانا بازرگانی

trade name  ناڤێ بازرگانی

trade price  به هایێ بازرگانی

trader , n  بازار ڤان ، بازرگان

trade - route  رێ یا بازرگانی

trade - school  دبستانا بازرگانی

trade - show  نیشانگه ها بازرگانی

tradesman , n  بازرگان

trade - union or trades union  یه کیه تی یا کارکه ران ، یه کیه تی یا پیشه گه ری . کومکار

trade - unionism  یه کیه تیتی

trade - unionist  ئه ندامێ یه کیه تی یێ

trade - wind  بایێ بازرگانی

trading , n  بازارکاری . بازارکرن . بازار . بازرگانی

tradition , n  توره . باستان . ڤه وات . لاسایی . ئه ریت . رێزک . باو

traditional or traditionary ,adj  ئه ریتی

- singer  ده نگبێژ

traditionalism , n  ئه ریتی تی

traditionalist , n  ئه ریتگر ، ڤه واتگر

traditionalize , vt  ئه ریتی دکت

traditionalize , adj  ئه ریتیکری

traditionalizing , n  ئه ریتیکرن

traditionally , adv  ب ئه ریتی

traditionless , adj  بێ ئه ریت

traditor , n  ڤله هێ خنز یان ترسونه ک ( ل ده ستپێکا ڤله هی یێ )

traduce , vt  بێ رومه تی دکت. دچرینت . ئێریش دکت ( ره خنه ) . باشبێژی دکت

traduced , adj  باشبێژیکری

traducement , n  باشبێژی

traducer , n  باشبێژ

traducian (ist ) , n  مروڤێ باوه ر دکت کو گیان ، ل گه ل له شی ، دزێت

traducing , n  پاشبێژیکرن

traffic , n  رێبورین . رابورین . هاتن وچون . بورین . دابورین

- circle  مه یدانا گروڤرا دابورینێ

- court , n  دادگه ها دابورینێ

trafficability , n  بورینباری

trafficable , adj  بورینبار

trafficator , n  ئالاڤا نیشانکه را بورینێ

traffic engineering, n — ئه ندازه یا دابورینێ

traffic island , n — به یاڤا ناڤ ریکێدا بۆ بورینا په یایان

traffic jam , n — پر دابورین ( ناپوره )

trafficked , adj — دابورینکری

trafficker , n — بارزگان

trafficking , n — دابورینی . بازرگانی

traffic signal or light , n — روناهی یا دابورینێ . کلوشک

traffic warden , n — وریبان یان هاریکه رێ دابورینێ

tragaconth , n — به نیشته‌ک سپی یان سور ( ژ هه له زه کێ بۆ ده رمانی )

tragedian , n — نڤیسه رێ تراجیدی ( کوڤانی )

tragedienne , n — کردارا تراجیدی

tragedy , n — تراجیدی . کوڤان

tragic (al) , adj — کوڤانی

tragically , adv — ب کوڤانی

tragicomedy , n — که نی کوڤانی

tragicomic , adj — که نینی کوڤانی

tragopan , n — پور یان تراجێ شاخدار

tragus , n — سنگوک ( ل پێشی یا گوهی )

trail , n , vt , i — ده ربازگه . شوپ . شون . کاروان . دوڤ . شڤه رێ ، دخوشت . بنێت دامیلان ، ( ڤه رمی ) دچت . ل دوڤ دچت . دکشت ( سه ر نه ردێ) ، پاش دکه ڤت ( پێشبرکێ . یان پێشیه زین )

trailed , adj — شونکه تی . شه ڤاندی

trailer , n — راکێشه‌ک، فیلمه ک کورت . هه له زه ک هلپرژینه

-camp,court or park , n — مه یدان یان راوه ستگه ها راکێشه کان

trailerable , adj — کشانبار

trailering , n — کشاندن

trailing , n — په یدوزی . شونکه تن . شه ڤاندن . په یچون . دوڤکه تن

- edge — ره خێ پاشی ( ژ چه نگی )

train , n — بوش . ریزگه ل . هه ڤکێش

- of idea — زنجیرا هزران

train , vt , i — فێر دکت . هین دکت . مه شق دکت

trainability , n — مه شقباری

trainable , adj — هیندار . مه شقبار

trainbearer , n — دوڤ هه لگر (یا کراسێ بوکێ )

trained , adj — مه شقکری . راهینایی . ریکری

- nurse — په‌رستار یان نه خوشه ڤانا راهینایی

trainee , n — سیار . شاگرد

trainer ,n — راهین.مه شقیار.هینکه ر. مه شقڤان

training , n — مه شق ، سه رمه شق . ریکرن . راهینان . هینکرن.مه شقکرن

- college — زانستگه ها راهینانێ

- school — دبستانا راهینانێ

training less , adj — بێ راهینان . بێ مه شقکرن

trainload , n — بارێ هه ڤکێشێ

train man , n — کارکه رێ هه ڤکێشێ

train oil , n — رونێ نه هه نگی

train sick , adj — گێژێ هه ڤکێشێ

traipse , n , vi , t — گه ران . چونا ماندی ، باپیلی دکه . دگه رت . دچت

traipsed , adj — گه رایی

traipsing , n — گه ران

trait , n — روچک . ره وشت . تایبه تی . سنجی . روخسار . گه د . شان

traitor , n — بێ به خت . ته پره ش . زه غه ل . زک ره ش . ناپاک . ئه وان . خنز

traitorous , adj — خنزکار . جه گه رمژ

traitorously, adv — ب خنزی

traitress , n — خنز ( مێ )

traject , vt — دگوهێزت

trajection , n = trajectory

trajectory , n — رێگه ، رێ یا کرڤی یا هاڤێژ ، دوڤه لانک یان ستێرا گه روک

tra - la , interj — ده ربرینا شادی یێ

tram , n , vi , t — بارکێش ( ل کانزایێ ) . ترام، کومری دگوهێزت ( ب بارکێشێ ل کانزایێ ) ، ل ترامێ سوار دبت

- car گوهێزوکەک تراماباركێش ( ل كانزایێ )
- line هێلا ترامیێ
trammed , adj گوهازتی ( ب . ترامیێ )
trammel , n , vt چنگالێ كوچكی بۆ هلاویستنار قازانان
ل سه ر ئاگری . به ند . گیرو . تور
( بۆ گرتنا ماسی یا ، یان بالنده یا )
كوت . ئالاڤا نه قشكرنا هێكه یی ،
دكه‌ڤینت ناڤ ته‌لهێدا . به ند دكت. گیرو
دكت . ب تورێ دگرت
trammel (l) ed , adj داڤكری
trammel(l) ing , n داڤكرن
tramming , n گوهازتن ( ب ترامیێ )
tramontana , n بایێ سارێ باكوری یێ نه دریاتیكی
tramontane , adj , n نشته یێ ره خێ دی یێ چیایی : بیانی
ل ره خێ دی یێ چیایێ ( ئه لپ )
tramp , n , vi , t گه روك ( بۆ پارسێكی یێ . فه لیته .
گه ده . ئێپه ری . سه رسه ری، ده نگێ
پێ یان ، رێباری دكت ( په یا ) . ددت
سه ر ، باپێڤی دكت
trample , n , vt , i بازدان سه ر ، پێپه س دكت .
دته پسینت . دپه لخینت . ددت سه ر
trampled , adj پێپه سكری
trampler , n پێپه سكه ر
trampling , n پێپه سكرن . ته پساندن
- down دانسه ر
trampoline , n ترامپولین : په هله وانیتی. هه رزالا
په هله وانی
tramroad , n رێ ئاسنا كانزایێ
tramway , n رێ یان هێلا ترامیێ
trance , n , vt دلشادی، مه ستی، بێ‌هشی، بێقام دلشاد
دبت . مه ست دبت . بێ هش دبت
tranced , adj بێ هشكری
tranche , n پارچه‌یه‌ک نه خاسمه ژ داهاتی
tranquil , adj ئاسوده . هه دار . هێمن ، ئار ام
- mind هشا هه دار
- scene دیمه نێ هه دار
- surface (of pond ) رژگه را هه دار

tranquility , n ئارام . هه دان . متبون ، دلنیابون .
هه داری . هێمنی
tranquil(l)ization,n هه دراندن . هه داركرن . هێمنكرن
tranquil (l) ize , vt مت دكت . هێمن دكت
tranquil (l) izer , n ئێشبر . هێمنكار . ئارامده ر .
ده رمان ڤه زین . ئێش راوه س
tranquilly , adv هه داره كی ، ب هه داری
tranquilness , n هه داریتی
trans- پێشگره كو تێرایه ، پاشه
transact , vi , t بازار دكت.كار دكت . كاری ل گه ل
دكت . كار بازاری دكت
transaction , n كاركرن . كار ل گه لكرن، كار بازار
transactional , adj كار بازاری
transalpine , adj , n نشته جی یێ پشت چیایێ ئه لپ .
كه تی پشت چیایێ ئه لپ
transaminase , n ئه نزیما گوهازتنا ئه مینی
transamination , n گوهازتنا ئه مینی
transatlantic , adj پاش یان پشت ئه تله نتیكی .
دئه تله نتیكرا . ئه تله نتیكرا
transceiver , n هنێر نو وه رگر
transcend , vt , i ژێ دبور ینت . سه ر دكه ڤت .
سه ررا دبورت . بالاتر دبت
transcendence , or سه ركه تن . بالابون
transcendency , n
transcendent , adj , n بونه وه رێ سه ر هه بونا مایه یی
شێلی . ئالوز . پاش مه ودایێ
ئه زمونی . ژێ بوراندی . بالا
transcendental , adj ئالوز ، پاش مه ودایێ سه رهاتنێ
- function هوكارێ بالایی
- object هه بیه رێ راست
- meditation رامانكرنا بالابونی
- unity یه كه تی یا تێگه هشتنی
transcendentalism,n ژیرزانی یا بالایی تی شێلی تی .
ئالوزی تی كو مروڤ راستی یێ
دزانت ب هزركرنێ نه ئه زمونێ یان
سه رهاتی یێ
transcendentalist , adj , n ژیرزانێ بالایی تی یێ

transcendently,adv ب بالابونی ، بالابونه کی
transcontinental,adj ناڤ قاره یی ، ناڤ که رته یی
transcribe , vt وه ردگێرت . ئاوازی راست دکت ( ب هێمایێن ده نگی ) ، تومار دکت . رۆنڤیس دکت ، دوه شینت ( به رنامه یا ئێزگه یی یان ته له ڤزیونی یا تومارکری )
transcribed , adj رۆنڤیسیکری
transcriber , n وه رگێر ، نڤیسه ر
transcribing , n رۆنڤیسکرن
transcript , n ده فته را پله یێن شاگردی ( تومارا دبستانێ ) . رۆنڤیس
transcription , n ئاوێن (بۆ لێدانێ ل ئێزگه یێ) ، ئاواز راستکری . رۆنڤیس
transcriptional , adj رۆ نڤیسی
transcription ally,adv ب رۆ نڤیسی
transcriptionist , n رۆنڤیسکه ر
transcriptive , adj رۆنڤیسی
transcurrent , adj لوزه وێ پانی
transcutaneous , adj ناڤ چه رمیرا
transduce , vt دگوهۆرت ( ئوزه )
transduced , adj گوهۆری
transducer , n وزه گۆر : ئالاڤا گوهارتنا تاپه ک تشته کێ بۆ ئێکه دی ( وه ک په ستانێ بۆ ڤولتی یێ )
transducing , n گوهۆرین
transect , vt پان دبڕت
transection , n پان بڕین
transept , n ره خێ دێرێ
transeptal , adj پێوه ندیدارێ ره خێ دێرێ
transexual = transsexual
transfer , n , vt گوهێز . گوهارتن ، دگوهێزت
- form گوازنامه . گوهێزنامه
transferability, n گوهێزباری
transferable , adj گوهێزبار
transferee , n بۆگوهارتی . گوهارتی
transference , n گوهارتن
transferer , n گوهێز : ژ دره کێ بۆ دره ک دی
transferor , n گوهێز : ده ست ژ مافی یان خودانی یێ به ردایی
transferred , adj گوهارتی
transferrin , n پروتینا ئاسنی دخوینا جانه وه ریدا دگوهێزت
transfiguration , n دیاربونا عیسا پێغمبه ری ل سه ر چیایی. جه ژنا دیاربونێ . گوهورینا نژیار یان شکلێ ده رڤه یی
transfigure , vt شکودار دکت . نژیاری دگوهورت
transfinite , adj پتر ژ هه می ژمارێن راده دار . پاش راده
transfix , vt تێرادکت . کون دکت . لێددت . قایم دکت ب لێدانێ
transfixion , n کونکرن . تێراکرن
transform , vt دگوهورت
transformable , adj گوهوربار
transformation , n گوران . گوهوران . گورین . گوهورین
transformational,adj گوهوری
transformationally ,adv ب گوهوری . گوهوره کی
transformative,adj گوهێر
transformer , n گورینک ، گوره ر
transfusable , adj گوهێزبار
transfuse , vt خوینێ دگوهێزت . تێرا دچت . دگوهێزت
transfused , adj گوهارتی
transfusible , adj گوهێزبار
transfusing , n گوهارتن
transfusion , n گوهارتن

transfusive , adj گوهێزدار

transgress , vt دە ست درێژی دکت . گونە هی دکت .
سە رکێشی دکت . دچرینت

transgression , n گونە هی . سوچ . تێپە رین

transgressive , adj دە ست درێژدار ، تێپە رینی

transgressor , n سە رکێش

transhumance , n گوهازتنا کە شی یا تە رشی

transience , n زو نە مانی

transient , adj مێهڤانێ دە مە ک کورت . زو نە مایی.
پە نە سە . کاتی . دە مدار ، مروڤێ
گە روک ( بۆ پە یداکرنا کاری )

transiently , adv دە مە کی ن

transilluminate , vt روهنی سە ح دکت

transillumination , n سە حکرنا روهنی •ٔ

transilluminator , n سە حکە رێ روهنی

tranisre , n دە ستورا دە رئینانی

transistor , n گوازینوک . ترانزستە ر . ئالاڤا
ئێلێکترونی بۆ رادیو

transistored , adj ترانزستە رکری

transistorization , n ترانزستە ر کرن

transistorize , vt ترانزستە ردکت

transistorized , adj ترانزستە رکری

transistorizing , n ترانزستە رکرن

transit , n ڤە کوچاندن . تێپە رین . دابورین

- compass ئالاڤا پیڤیاری بۆ پیڤانا گوشە یا
ئاسویی ، بو رینا ژ خوڵە یا لە شێ
ئە سمانی ژ درا درێژە هێلێ

- duty باجا دە ربازبونێ ژ وە لاتە کێ

- instrument نوربینا دە ربازبونێ ، ئالاڤا زێرە ڤانی
یا بورینا لە شێن ئە سمانی ژ درێژە
هێلێ

transition , n بورینا ژخوڵە یا لە شێ ئە سمانی ژ
درا درێژە هێلێ ٔ . برگە یا گوهێزی .
گوهارتن . گوهازتن

- stage کوچا گوهێزی

- tumour پە رچڤتنا گوهێزی

transitional , transitionary , adj گوهێزی

transitionally , adv گوهێزە کی ، ب گوهێزی

transitive , adj , n تێپە رە کی . دە ربازە . گە راندی .
تێپە ر

- verb لێکە را گە راندی . کارێ لێکە ر .
کارێ تێپە ر

transitively , adv ب تێپە ری

tranasitiveness , n تێپە ریتی

transitivity , n تێپە ریتی

transitorily , adv ب دە مداری

transitoriness , n دە مە کیتی

transitory , adj ناڤابویی . دە مدار

translatability , n وە رگێرباری ، تە رجمە باری

translatable , adj وە ر گێربار ، تە رجمە بار

translate , vt تە رجمە دکت . وە ردگێرت

translated , adj وەرگێرایی.پاچڤانکری، تە رجمە کری

translating , n تە رجمە کرن . وە رگێران .
وە رگە راندن

translation , n وە رگێران . تە رجمە

translational , adj وە رگێرانی

translative , adj پێوە ندیدارێ گوهازتنێ

translator , n تە رجمە دار ، پاچڤە زان . پاچڤان.
تە رجمان . وە رگێر

translatory , adj پێوە ندیدارێ لڤینا رێزکی

transliterate , vt نڤیسینا زمانە کێ ب تیپێن زمانەک
دی دنڤیست

transliterated , adj پێوە ند یدارێ نڤیسینا زمانە کێ ب
تیپێن زمانە ک دی

transliterating , n نڤیسینا زمانە کێ ب تیپێن زمانە ک
دی

transliteration , n نڤیسینا زمانە کێ ب تیپێن ز مانە ک
دی نڤیسی

transliterator , n نڤیسە رێ زمانە کێ ب تیپێن
زمانە ک دی

translocate , vt دگوهێزت

translocation , n گوهازتن (ژ دە رە کێ بۆ دە رە ک دی)

translucence , n رونی . روهنی

translucency,n=translucence

translucent , adj رون . روهن ، پاش رون
translunary , adj پاش هه یفی
transmarine , adj ناف ده ریایی را ، ژ پاش ده ریایی هاتی . نشته جی ییْ پاش ده ریایی
transmembrane , adj دیه رده یی را
transmigrate , vi له شدار دبت . کوچه ر دبت
transmigration , n له شداربون . کوچه ربون
transmigrator , n کوچه ر
transmigratory , adj کوچه ری
transmissibility , n درمی . گوهیزباری
transmissible , n گوهیزبار . درم
transmission , n راگوهازتن . راگوزتن . هنارتن . ناردن . گه هاندن
transmissive , adj گوهیزبار . گوهیزی
transmissivity , n گوهیزیتی
transmit , vt تیرا دچت ( روناهی ) . دهنیرت . دگوهیزت
transmittable , adj گوهیزبار
transmittal , adj گوهیزی
transmittance , n گوهازتن
transitted , adj گوهازتی ، هنارتی
transmitter . n نیریار . پیلوه ش . نیره ر
transmitting , n هنارتن
- set ئالاڤا نیره ر
- station ئیزگه یا پیلوه شین
transmogrification,n گوهارتن
transmogrified , adj گوهارتی
transmogrify , vt دگوهورت ( وه ک جادوگه ری )
transmogrifying , n گوهارتن
transmontane , adj = tramontane
transmutation , n گوهارتنا مایه ییْ ئه رزان ( بو زیڤ ئو زیری). گوهورین . گوهارتن . گوهوران
- glaze گوهورینا هیمانه کیْ یان به ردیله کیْ بو ئیکه دی
transmutative , adj گوهورینی
transmute , vt , i ( شکلی سروشت یان مایه ) دگوهورت
transmuted , adj گوهارتی
transmuting , n گوهارتن
transnational , adj ناڤ نه ته وه یی
transnatural , adj =supernatural
transnormal , adj پاش ئاسایی
transoceanic , adj ناڤ زه ریایی
transom , n به شت
- of door ده ری ییْ به شت
- window په نجه رکا به شت
transonic also tran - sonic , adj نیزیکی له زا ده نگی
transpacific , adj ناڤ زه ریاییْ هیمنرا . پاش زه ریاییْ هه دار
transpadane , adj ل پاش ( سه رچه می )
transparence , n = transparency
transparency , n دیوه ده ری. تشتیْ روهن . روهنیتی
transparent , adj پاش بین ، دیوه ده ر . روهن . رون . روشه ن . چروسکدار
- body رۆ ته نک . له شیْ رون
- head kerchief , n ته مه زی
transparently , adv ب روهنی
transparent ness , n روهنیتی
transparentize , vt روهن دکت ، دیوه ده ر دکت
transparentized , adj روهنکری ، دیوه ده رکری
transparentizing , n روهنکرن ، دیوه ده رکرن
transpersonal , adj پاش مروڤی
transpicuous, adj = transparent
transpierce , vt تیرا دچت
transpiration , n خوها هه له زی ، خوهـ . خوهدان
transpire , vi , t ئه شکه را دبت ، دیار دبت . ده لیْن دبت . خوهـ ددت
transpired , adj دیاربویی
transpiring , n دیاربون
transplacental , adj قه ومینی یا هه ڤال بچوکی
transplacentally , adj ب قه ومینی یا هه ڤال بچوکی
transplant , n نه مام ، شه تل

transplant , vt , i دگوهێزت ( هه له زێ یان له ش له ندامێ )
transplantability , n چاندنله باری
transplantable , adj چاندنله بار
transplantation , n چاندنله
transplanter , n چاندیار
transpolar , adj ناڤ جه مسه رێ باکوری یان باشوریرا
transponder , n وه رگرێ به رسفدار، ئالاڤکا رادیو یان رادار کو گاڤا نیشانه کێ وه ردگرت جهدا به رسڤێ دهنێرت )
transpontine , adj که تی ره خێ دی یێ پرێ
transport , n شادی، گه می یا گوهازتنا سه ربازئو که ره سته یان ، ریزکا گوهازتنێ . تاوانباریێ‌سرگومکری، که یف، گوهاستن. گوهازتن . گوهێز . له گوهازتن ، بالافرا گوهازتنا مروڤ ئوتشتان
- aiplane بالافرا بارکێش
bridge پرا له گوهازتنێ
- charges بارانه
transport , vt نور دکت . دگوهێزت . سرگوم دکت
transportability , n گوهێزباری
transportable , adj گوهێزبار
transportation , n راگوهاستن . گوهاستن . گوهازتن . له گوهازتن
- costs بارانه
transportational , adj له گوها زتنی
transported , adj گوهاستی . گوهازتی
transporter , n گوهێز
- bridge پر بۆ هه لگرتنا ئوتومبیلان ئو گوهازتنێ ئو ده ربا زکرنێ ژ رۆباری
transporting , n گوهازتن ، گوهێزی
transposable , adj گوهازتنبار
transpose , vt دگوهورت ( شون یان بارێ تشتی) . دگوهێزت ( ژ ره خه ک هه ڤکێشێ بۆ ره خێ دی ) ، پێسترکێ دگوهورت . دگوهێزت . دگوهورت . وه ردگێرت
transposed , adj گوهارتی
transposing . n گوهارتن

transposition , n گوهازتن . گوهارتن
transsexual , adj , n ناڤ ره گه زی یان زایه ندی . مروڤێ ب رۆچکێن سروشتی یێن زایه نده کێ ئو ب رۆچکێن ده رونی یێن زایه نده ک دی
transsexualism , n رۆچکی تی یا سروشتی زایه نده کی
transsexuality , n رۆ چکیتی یا سروشتی یا زایه ندی
transshape , vt دگوهورت ( شکلی )
transship , vt , i دگوهێزت ( ژ گه می یه کێ یان ئوتو مبیله کێ بۆ ئێکه دی )
trans - sonic = transonic
transubstantiate,vt, i دگوهورت (ماده یه کێ بۆ ئێکه دی )
transubstantiation, n گوهارتن . گوهورین
transudate , n بورین ( ئاڤه کی) دناڤ سو ( کون ) یان ڤالاتی یا په رده یێرا
transudation , n بورین ( ئاڤه کی ) دناڤ کون یان ڤالاتی یا په رده یێرا
transude , vi , t ( ئاڤه کی ) دناڤ سو ( کونک ) یان ڤالاتی یا په رده یێرا دبورت
transuded , adj ده رباز بویی ( دناڤ په رده یێرا)
transuding , n ده ربازبون
transuranic , adj پاش یورانیوم : ژمارا گه ردیله یی مه زنتره ژ ژمارا گه ردیله یی یا ( یورانیوم )
transuranium , n هێمانا ب ژمارا گه ردیله یی مه زنتر ژ یورانیوم
transvaluate=transvalue, vt به ها دکته
transvaluated , adj به هاکریله
transvaluating , n به هاکرنله
transversal , adj , n هێلا لاده کی . هێلا پانی . پانی
transverse , adj ,n رۆپان . لاده کی
- axis ته وه را لاده کی
- colon زه بلوتا راکێشایی
- wave پێلی رۆپان
transversely , adv ب لاده کی
transvest , vt جلێن زایه ندێ (هه ڤبه ر) به رامبه ر دکت به ر خو

tranter , n هه لگرێ تشتان ( بۆ فرۆتنێ ) . فروشیارێ گه رۆک

trap , n هێله ک ، داو . داڤک . سوتال . سوتل . بوسه . پوس . ته له ، ته لهه ، داڤ . خه فک

- celler ڤالاتی یا بن شانوییێ

- door داڤ ده رگه

- rock که ڤرێ برکانی

- setting داڤ ڤه دان

trap , vt , i داڤ دکت . دخه ملینت

trapes , n = traipse

trapeze , n هێنسکا په هله وانی یان وه رزشی

trapezium , n ترابیزیوم : چار لاییێ نه رێزکی کو جوته ک لایێن به را مبه ر ته ریبینه

trapezius زه بله کا نیڤ لادایی ( ل هه ر دو ره خێن پشتێ )

trapezohedron رۆیێ لوزینه یی یێ لادایی

trapezoid , n نیمچه ته ریب ، نیڤ لا ته ریب

trapezoidal , adj نیڤ لا ته ریبی

trappean , adj ژ که ڤرێ برکانی

trapped , adj خه ملاندی ، داڤکری

trapper , n داڤکه ر

trapping , n خه ملاندن . داڤکرن . خاپاندن

trappings , n خه مل . نیشان

trappy , adj خاپین

traps , n , pl که ل و په لێن که سی

trapshooter , n نێچیرڤانێ کوترێن ئاخێ کو دهاڤێن ئه سمانی بۆ ستێرکێ

trapshooting , n نێچیرا کوترێن ئاخێ کو دهاڤێن ئه سمانی ( بۆ ستێرکێ )

trash , n کارێ پوچێ هونه ری ، پوچبێژی . پاشماوه .، خولت . گلێش . که سته ک . ته رت

- man گلێشکار

trash , vt سپی ( بێ تیڤل ) دکت ( له ڤه نێ شه کرێ )

trashy , adj پوچ

trass , n که ڤره ک برکانی راینی(ل ئه لمانیا )

trauma , n ڤه پون . ئازار . برین . راته کاندن

traumatic , adj ڤه پونی . هه رشی . برینی . راته کاندی

traumatism , n ڤه بونیتی . برین

traumatization , n ئێشاندن

traumatize , vt ڤه بون دکت .بریندار دکت، دئێشینت

traumatized , adj ئێشاندی

traumatizing , n ئێشاندن

travail , n , vi زهێ . ژان . ئێش ، ئازار . ئه رک. کارنه خاسمه رێنجبه ری ، زهێ دبت. رێنجبه ری یێ دکت

trave , n ستونێ پانێ بانی

travel . n رێویتی . رێباری

- agency پێشکاری یا رێبارێ

- agent پێشکارێ رێبارێ

- ticket رێنامه

travel (l) ed , adj رێبارکری

traveller , n رێویک . رێڤنگی . رێبوری . وه لاتگه ر. رێوی . رێبار . رێبوار گه رال

-' s check چه کێ رێباری یێ

travelling , n رێباریکرن

- bag خورج ، جه نته

- crane هه لگرا گه رۆک

- itinerant گه رۆک

travelogu (e) , n گوتارا وێنه کری لسه ر رێباری یه کێ

traversable , adj ده ربازبار

traversal , adj بورینی . ده ربازی

traverse , n , vt , i ده ربازبون ، بورین ، دچت . دبورت

traversed , adj ده رباز بویی

traverser , n رێبار

traversing , n دابورین . بورین

travertin(e) . n ترافێرتین : به ره ک ڤیری یه

travesty , n چا ڤليكرنا پيكه نيني، زر وێنه ( دادى يان ديموكراتى ) . لادان

travesty , vt چاڤ لێدكت (ترانه یی یان پێکه نینی )

travois , n بارکێشیێ هندو کێن سور

trawl , n ترول : تورا ماسیگرتنێ ( مه زن ئو قوچه کی ل بنێ ده ریایی دئێت کشاندن ) ، نکلوکا زنجیره کری

- line به نکێ تورا ترولی

- net تورا ترولی

trawl , vi , t ماسی یا دگرت ب تورا ترولی یان نکلوکێن زنجیره کری

trawler , n گه می یا ماسیگه ری

- man ماسیگر

tray , n ته پسی . سێنی ، سینی، به رکه شوک. له نگه ریک . له نگه ر .

- copper به رگه ش

- wide ...... له نگه ری

treacherous , adj بێ به خت . ته پره شی . جه گه ر مژ

treacherously , adv خنزه کی ، ب بێ به ختی

treacherousness , n بێ به ختیتی

treachery , n ته پره ش . بێ به ختی . ناپاکی . خنزی . جه گه ر مژی

treacle , n دوشاڤا شه کرێ

treacly , adj دوشاڤی

tread , n , vi , t ده سدانک . پارچه یا ب ته ردیڤه ژ پێ، پێلاڤ یان تایه رێ ...شون یان ده نگێ پێلیکرنێ ، پینگاڤ ، پێلیکرن، پارچه یا بلندا ئاسوینی ژ پێسترکێ، دانکه ڤت(نێرێ بالنده ل سه ر مێ یێ). دچت . پینگاڤ دهاڤێت ، دهه رشینت. ته په سه ردکت . ددت سه ر

- to ........down پێ لێدکت

- to....in some body's steps چاڤ لێدکت

- to ....on air شاد یان به ختیار هش دکت

- to...on somebody's toes شه پرزه دکت یان دئێشینت

- to .....out ڤه دکوژت

- to ....under foot پێ لێدکت

- to .....water پێ ئو ده ستان دلڤێنت ( دا نوقی نه بت )

treaded , adj دایی سه ر

treading (on) , n پێلیکرن

treadle , n , vi پێلیکه رک : ده ستکێ ب پێ یێ کاردکت ، پێلیکه رکێ ب کار دکت

treadmill , n روتینێ مروس . روتینێ بێ زار . ئاشێ پێلیکرنێ ( بو ته شکه نجه دانێ )

treason , n ناپاکی ، بێ به ختی . خنزی

treasonable , adj خنزبار

treasonably , adv ب خنزباری

treasonous, adj= treasonable

treasurable , adj به ها گران . هێژا

treasure , n , vt په رگه ل سامان ، گه نجینه . خه زینه.خه زنه، په رگال، گه نجینه دکت

- house گه نجینه خانه

- trove دیتن ، په یداکرن . گه نجینه یا ڤه شارتی

treasured , adj گه نجینه کری

treasurer , n خه زنه دار . گه نجه دار . گه نجینه ڤان

treasuring , n گه نجینه کرن

treasury , n گه نجینه . خه زینه . گه نجه

- management خه زنه داری . گه نجه ڤانی

- notes (n . pl) کاغه زێن دراڤی یێن خه زینه یێ

treat , vi , t به هایێ ڤه خوه ندنێ ددت، مێهڤانداری دکت . دان و ستاندن دکت . چاره دکت

treat , n ڤه خوه ندن ( بو خوارن یان ڤه خوارنێ . خوه شی )

treatability , n چاره باری

treatable , adj چاره بار

treated , adj ڤه خوه ندی ، چاره کری

treater , n چاره که ر

treating , n سازان . سازاندن . چاره

treatise , n زانستنامه . ڤاڤێژه ک

treatment , n تیمار ، سازاندن . ده رمانکرن . ئیش .
چاره . چاره کرن
treaty , n هه ڤالبه ندی ، په یمان
treble , adj , n , vt , i سێ جاری ، سێ جار ، سێ جار دکت
trebled , adj سێ جار کری
trebling , n سێ جارکرن
trebly , adv سێ جاره کی
trebuchet , trebucket چمچیر
tree , n په یکه رێ خورجێ ، ته وه ره یێ
عه ره بانه یێ ، قالبێ پێلاڤێ . سیداره.
کاریته . ستون . ده ستک . خاچ .
دره خت . دار ، دارێ مالباتێ
- fern ........ سه ر خه س یان گه ز
- nail سنگ ( کون پوف دبت هه که شل ببت )
- of heaven دارا ئه سمانی (داره ک تیز سیبه ره)
- of liberty دارا ئازادی یێ
- of life دارا ژیانێ
- plane ..... چنار
- shrew جانه وه ره ک مه مکدار وه ک سفوره یی
- ...'s side shoot ده رح
- stump گونج . گلاره . قورم
- surgeon نژدارێ داران . پسپورێ نژداری یا
داران
- surgery نژداری یا داران
- teak .... که ڤوت
- toad به قێ داران
- trunk قورم
tree , vt پێلاڤێ فره دکت (ب قالبی) ، ته نگاڤ
دکت .بشه قینت سه ر داری
treed , adj ته نگاڤکری
treeing , n ته نگاڤکرن
treeless , adj بێ دار
treelike , adj وه ک داری
trefoil . n , adj وینجه . نه فه ل . سێپه ر . سه پار
trehala , n گه زو
trehalose , n شه کرا به لوری ( بناڤ هاڤه یێ ئو
هنده ک قارچکاندا )

treillage , n که پرکا مێوی
trek , n , vi رێباری یا عه ره بانه یا گایان
نه خاسمه کوچه ری یا هه موکی ،
رێ یا خو هێدی ئوزه حمه ت دبرت.
رێباری دکت . کوچه ر دبت
( ب عه ره بانه یا گایان )
trekked , adj کوچه ریوی
trekker , n رێبارێ عه ره بانه یا گایی
trekking , n کوچه ربون
trellis , n, vt که پرک ، که پرێ چێدکت
- work که پرک
trematode , n ته خلیت کرمه ک پانه
tremble , n , vi گزگز . گریزه . سه رم . له رزین .
له رز ، دهه ژت . دله رزت
trembled , adj گزگزاندی . له رزی
trembler , n له رزوک
trembling , n له رزوک . وه ش . ته ڤز. گزگزاندن.
راهه ژاندن . له رزین
- poplar سپیندارا له رزوک . وێنه یی : ژیان
پان چاره نڤیسا مروڤی
trembly , adj له رزی
tremellose , adj هه ژینی وه ک جیلی ( هه له زه )
tremendous , adj ئه ژده ها . زور . گه وره . مه زن
- difference جودایی یا مه زن
tremendously , adv ب گه وره یی ، ب مه زنی
tremendousness , n مه زنیتی ، ئه ژده هایی تی
tremolite , n تریمولایت : مینرتاله ک بریتی یه ژ
سلیکاتێن کالسیوم ئو مه گنیسیوم
tremolo , n کارتێکرنا له رزی ل سه ر
سترانبێژی یێ یان له یزتنا ئالاڤێن
ژه نی
tremor , n, vi بچرک ، هه ڤریشک ، له رزین .
ته ڤز. گزگز. گریزه. شه ک. سه رم.
له رز .له ره ، دهه ژت . دله رزت
tremulant , adj ترسایی ، بزدهی ، له رزوک
also (tremulent)

tremulous , adj له رزوک . له ره که ر

- hand ده ستی له رزی

- leaves به لگین له رزی

- line به نگی له رزی

- voice ده نگی له رزی

tremulously , adv ب له رزوکی

tremulousness , n له رزوکی تی

trenail = treenail

trench , n تالاده . ته بی . هه رق . تاپی . سه نگه ر . گوندک . چه په ر . کوزک خه نده ک . خه نده ق

- coat پالتوین بارانی

- fever تایا چه په ران ( دئیت سه ربازین ناف چه په راندا )

- foot پی ین چه په ری ( نه ساخی یا پی ین سه ربازین ناف چه په راندا دگرت )

- irrigation ..... جو

- mortar ته قنا چه په ران

trench , vt , i نیزیک دبت . چه په ر دکت . دپاریزت ( ب چه په ری ) . دکولت . نه قش دکت . چه په ر دکولت

trenchancy , n دژواری ، توژی ، تیژی

trenchant , adj دیار . گه زدار . چالاک . توژ ، تیژ

- sword شوری توژ یان تیژ

trenchantly , adv ب تیژی

trencher , n ده پک ( بو پیشکیشکرنا خوارنی وه ک سینی یی )

trend ,vi , n حه ز دکت . نیاز دکت ، نیاز . جلین باو ، ئاره زو . باو

- setter رینه ری تایاری

trendily , adv ب باوی

trendster , n باوکه ر

trendy ,adj باو

trental , n سه نفیژین په یهاتی بومری

trepan , n سمتوکا مه زن(بو ده ریکی کانگه هان)، خیزاری کلوخی. چقو . فیلباز. خاپین ، داف

trepan , vt دکه فینت ناف داڤیدا . فینت دکت . دخاپینت . کون دکت ( ده ریکی کانگه هی )

trepang , n ئاروین ده ریایی : جانه وه ره ک ده ریایی

trepanned , adj خاپاندی

trepanning , n خاپاندن

trephination , n داڤکرن

trephine , n , vt خیزاری کلوخی،(کلوخی) ب خیزاری دبرت

trepid , adj ترسونه ک

trepidation , n بزدهین . ترس . له رز

treponema , n به کتریا یان درمه ک باده کی ( نه خاسمه ئه وا فره نگی چیدکت )

treponematosis , n نه ساخی یا درمی فره نگی

trespass , n , vi زینده گافی . گلی یا زینده گافی یی . ده ست دریژی . گونه هی . ده ست دریژی دکت. زینده گافی دکت. گونه هی دکت

tresspasser , n دوژمنکار ، زینده گاف کار

tress , n , vt گولی یاپرچی . پنج . زلف . که زی، که زی دکت

tressed , adj که زیکری

tressure , n شه لیتا ته نگ

tressy , adj که زی یی

trestle , n به ریالک ، هه لگر

- - bridge پرا هه لگری : پرا ل سه ر هه لگران

- table میزا هه لگری : کو ده پک داری یه ل سه ر به ریالکی

- work سکه له

trews , n ته نگه شه لوار

trey , n سی ( ل تاولی، دومینه ئو کاغه زانی)

tri پیشگره کو سی یه

triable , adj دادگه ریبار . ئه زمونبار

triableness , n دادگه ریباری ، ئه زمونباری

triacid , n ترشی یه ک ب سی گه ردیله یین ترشین هایدروجینی

triad , n سێیینه

triadic , adj سێیینه یی

triadically , adv ب سێیینه یی

triage , n جوداكرنا ( چه واتی )

trial , n بزاڤ . ته قه له ، دادگه رین . داد پرسی

- on ...... ل به ر دادگه هێ

- and error ته زمون ئو هه له . بزاڤ ئو هه له

- balance ته رازی یا ته زمونێ ( ل ژمارا باز رگانی )

- balloon بالونا ته زمونێ

- for murder دادگه رینا كوشتنێ

- heat پێشبركێ یا سه ره تایی

- match پێشبركێ یا ته زمونی

- run ب كار ئینانا ته زمونی ، ته زمون

- severe ...... مه نیه ت

triangle , n سێ كوچكه . سێ كوچک . سێ گوشه

- equilateral ...... سێ گوشه یا لا یه كسان

- isosceles سێ گوشه یا جوتێ لا

- right angled ..... سێ گوشه یا گوشه راست

- - scalene .. سێ گوشه یا لا نه یه كسان

triangular , adj سێ كونجی . سێ گوشه یی

triangularity سێ گوشه یی تی

triangularly , adv ب سێ گوشه یی

triangulate , vt , adj سێ گوشه یی دكت ، سێ گوشه یی

triangulation , n سێ گوشه كرن

triantelope , n كێزه ک ئوسترالی مه زن

triarchy , n حكومه تا سێ یان

triassic , adj كه ڤرێ جوراسی یێ سێ ته به ق

triatomic , adj سێ گه ردیله

triaxial , adj سێ ته وه ره

tribade , n ژنا مێباز

tribadism , n ژن مێبازی تی

tribal . adj ئێلی ، هوزی

- chief ئاغا

- leader ئاغا

tribalism , n هوزی تی

tribally , adv ب هوزی ، هوزه كی

tribasic , adj سێ تفت ( قلێ یی )

tribe , n ئیجاخ . ئوجاخ . تیره ، هوزه . ئێل . هوز

- nomadic ..... ئێل

- part of a .... زوم

- sub ...... تیره

tribesman , n زه لامێ هوزێ

triblet , n ستونا زڤرینا ره نده یی بو چێكرنا لوله ئو خه له كان

tribo پێشگره كو لێخوشینه

triboelctricity, n كه هره بێ یا لێخوشینێ

tribological , adj لێخوشینی

tribologist , n لێخوشینزان

tribology , n لێخوشینزانی

triboluminescence,n ده ركرنا روناهی یێ ژ ماده یه كێ ب گه مراندنێ

tribophysics , n فیزیایا لێخوشینێ

tribrach , n سێ برگه

tribrachic , adj سێ برگه یی

tribulate , vt ده ربگرت

tribulated , adj ده ربگرتی

tribulating , n ده ربگرتن

tribulation , n ده ر د ، ره نجین

tribunal , n دادگه . كوست

tribunate , n دوانگه

tribune , n به ره ڤان گه یا مله تی ، دوانگه

tribuneship , n ( ته ركێ ) به ره ڤانی یا مله تی

tributary , adj , n زێ . چه م

tribute , n ئولام ، بێش ، خه رج ، خوكی . به سن. باج. زوات. سه رانه. ستایش

tricar , n ئوتومبیلا سێ چه رخ

tricarboxylic , adj بریتی ژ سێ گروپێن كاربوكسیل

tricarpellary , adj سێ مێكوت خانه

trice , vt بابره كی رادكت ئو ب وه ریسی قایم دكت

trice, n گاڤ

tricep , adj , n ( زه بله ک ) . سێ سه ر نه خاسمه ل پاشی یا زه ندی

